





# ئۆتیزم وخێزان

رەحمان عەلی

٢٠١٤

چاپی دووەم

- ناوی کتێب: ئۆتیزمو خێزان
- نووسەر: ڕەحمان عەلی
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- پێداچوونەوەی چاپی دووەم: د. ئەفرام محمد حسن
- بەرگ و دیزاین: گۆران جەمیل
- ساڵی چاپ: چاپی دووەم ٢٠١٤
- چاپخانە: چاپخانەی هاوار
- سەرپەرشتی چاپ: کۆمەڵەی ئۆتیزمی کوردستان – لقی سلێمانی
- تیراژ: ١٥٠٠ دانە
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردنی ( ١٣٦٤ )ی ساڵی (٢٠١٣) پێ دراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

وَنُنَزِّلُ مِنْ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلاَّ خَسَاراً

(٨٢) سورة الإسراء.

صدق الله العظيم

# پێشکەش

- ئەم دیارییە بچووکە پێشکەشە:
- بەمنداڵانی ئۆتیزم پێش هەموو کەس.
- بەو دوو مرۆڤەی تا دەمرم لەبیریان ناکەم، هەرچەندە لێم دوربن (دایکم و باوکم).
- بەهاوسەرەکەمو هەردوو کچەکەم (ئیلیانو لەیان).
- بەهەموو ئەو کەسانەی خزمەتی منداڵانی ئۆتیزم دەکەن.

ڕەحمان عەلی

# سوپاس و پێزانین

- سوپاسی ڕێکخراوی فریاکەوتنی میللی (PAO) و کۆمەڵەی ئۆتیزمی کوردستان کە ئەرکی چاپی دووەمیان گرتە ئەستۆ.
- سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم، کە هاوکارییان کردم لە بەچاپگەیاندنی ئەم بەرهەمە.
- سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم. کە ئۆتیزمیان پێ ناساندم. تا بتوانم بچووکترین خزمەتیان پێ بکەم.

ڕەحمان عەلی

## ناوەڕۆك

# پێشەکی چاپی دووەم

کاتێك چاپی یەکەمی کتێبی (ئۆتیزم و خێزان)م خستە بەردەستی خێزانی منداڵانی ئۆتیزم، زۆر خۆم بە بەختەوە زانی بەتایبەت کە زۆر خێزان پەیوەندی پێوە کردم و دەستخۆشیان لێ ئەکردم، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هەوڵ بدەم کاری باشتر ئەنجام بدەم و خزمەتی زیاتر بکەم، بە تایبەت چاپی دووەمی ئەم کتێبە.

لە چاپی یەکەمی ئۆتیزم و خێزاندا کە کۆمەڵێك بابەتی تیۆری و مەیدانمان خستبووە ڕوو بۆ خێزانەکان، توانیمان لە چاپی دووەمدا کۆمەڵێك بابەتی بۆ زیاد بکەین، وەك ئەو بەرنامە و پرۆگرامانەی بۆ منداڵی ئۆتیزم بە کار دێت.

ڕەنگە چاپی یەکەمی کتێبەکە تۆزێك خێرایی پێوە دیار بێت، ئەمەش بە هۆی زەرورییەتی ئەو کتێبە بوو وەك سەرچاوەیەك بۆ خێزانی منداڵانی ئۆتیزم لەو کاتەدا، بەڵام لە چاپی دووەمدا توانیمان ئەو کەم و کوڕیانە چاك بکەین.

بۆچی ئۆتیزم و خێزان؟ مەبەستم لە کتێبە ئەوەیە کە خێزان بە پلەی یەکەم سوود وەربگرێت، چونکە خێزان هاوکاری یەکەمی منداڵی ئۆتیزمە، پاشان سەرەتای پەیوەندی و پێشکەوتنی منداڵی ئۆتیزم لە خێزانەوە دەست پێ دەکات، بۆیە

دەبێت بەردەوام خێزان پڕ چەك بێت لە زانیاری و بەرنامەکانی ئۆتیزم, بە تایبەت کە لە وڵاتی ئێمەدا هێشتا نەتوانراوە سەنتەرەکان بە شێوەیەك بێت کە سەرجەم منداڵانی ئۆتیزم لە خۆ بگرێت و خزمەتیان بکات.

داواکارم لە خوای گەورە ئەم کتێبە سوودێکی باش بە خێزانی منداڵانی ئۆتیزم و پسپۆران و ڕاهێنەرانی منداڵانی ئۆتیزم بگەیەنێت, لە هەمان کاتدا ئەم کتێبە هاندەرم بێت بۆ توێژینەوە و بابەتی زیاتر لە پێناو خزمەتی زیاتری منداڵانی ئۆتیزم.

ڕەحمان عەلی

سلێمانی / ٢٠١٤

# لەبری پێشەکی

بۆ ماوەی حەوت ساڵ وەك پسپۆری کۆمەڵایەتی لەدەزگای چاکسازی (بەندیخانە) بەهەموو بەشەکانییەوە کارم کردوە، خزمەتی ئەو کەسانەم کردوە، کە سەرپێچی یاساییان کردبوو، بەڵام خۆشبەختانە دواجار خۆمم لەم بەشە دۆزییەوە، واتا بەشی ئۆتیزم، ئەگەر کەس بەزیادڕەوی نەزانێت، ئەوە دەڵێم لەتەمەنمدا ئەوەندە خۆم بەبەختەوەر نەزانیوە، تا ئەو کاتەی خزمەتی ئەم منداڵانەم کردوە، بەتایبەت کاتێك دڵی خێزانێك خۆش دەکەین‌و پێی ڕادەگەیەنین، منداڵەکەتان ئەمڕۆ ئەو کارەی ئەنجامدا، ئەو خۆشییە لەچاوی ئەو خێزانانەوە بەدی دەکەین، بەڵام زۆر بەداخەوە کە ڕەنگە نەمانتوانی بێت، دڵی هەموو خێزانەکانی ئۆتیزم وەك یەك خۆش بکەین، ئەمە زۆر دڵگرانی کردوم لەمیانەی کارەکەمدا، بەڵام ئەو ئومێدەم هەیە، ڕۆژێك لەڕۆژان خوای گەورە یارمەتیمان بدات، کە بتوانین دڵی هەموو خێزانەکان وەك یەك خۆش بکەین.

زۆر هۆکارو فاکتەر پاڵنەرهەبوون بۆ ئەم توێژینەوەیە، گرنگترینیان نەبوونی یان کەمی سەرچاوەی کوردی لەسەر ئۆتیزم (خود تەنیایی) بوو، چی بۆ توێژەران‌و ڕاهێنەران، چی بۆ خێزانەکان، ئەکرێت بڵێم مەبەستی سەرەکی لەم

توێژینەوەیەدا خێزانە، چونکە کاتێک بەخێزانێك دەوترێت منداڵەکەتان ئۆتیزمی لەگەڵدایە، ئیتر ئەو خێزانە تووشی دڵتەنگیو خەمباری دەبێت، ڕەنگە زۆر خێزان مانای ئەو وشەیە نەزانێت، یان هەندێ خێزان یەکسەر پەنادەبەن بۆ (ئینتەرنێت)و لەسەر ئەم بابەتە شت دەخوێننەوە، بەلام ئەی ئەگەر خێزانێك لەلادێیەك منداڵێکی ئۆتیزمی هەبوو و نەخوێندەواریش بوو؟ ئەمە کێشەی گەورەیە، چونکە هێشتا ئێمە نەگەیشتووینەتە ئەو ئاستەی کاتێك بەخێزانێك دەوترێت منداڵەکەت تووشبووە بەئۆتیزم، ئیتر کەسێکی پسپۆر هەبێت ئۆتیزمی بۆ شی بکاتەوەو ڕێگەچارەکانی بۆ باس بکات، تەنانەت ڕەنگە هەندێ پزیشکی بەڕێز کە بە خێزانێك دەڵێت منداڵەکەت نەتوانێت هەموو لایەنەکانی بۆ شیبکاتەوە و چارەسەرەکانی بۆ باس بکات, بۆیە هەندێ خێزان دەیگێڕنەوە کاتێك پزیشکێك ئاگاداری کردونەتەوە کە منداڵەکەیان ئۆتیزمی لە گەڵدایە, لە پزیشکەکەیان پرسیوە چی دەرمانێکی پێ بدەین باشە, چونکە نەزانینی ئەو حاڵەتەو ڕوننەکردنەوەی بۆ خێزان کێشەیەکی گەورەیەو خێزان دەخاتە بازنەیەکی داخراوەوە, بۆیە هیوادارم ئەم کتێبە هاوکاری خێزانە بەڕێزەکان بکات و سوودی لێ ببینن لە خزمەت کردنی منداڵەکەیاندا.

لەم پێشەکییە کورتەدا دەمەوێت ئەوە بڵێم، ڕەنگە ئەزموونی ئێمە لەم بوارەدا نەگەیشتبێتە ئەو ئاستەی، کە لێکۆڵینەوەیەك یان نووسینێك لەسەر ئەم بابەتە ئاڵۆزە بنووسین، بەڵام نەبوونی سەرچاوە بەزمانی کوردیو نەبوونی کەسانی پسپۆڕ لەم بوارەو کێشەی خێزان لەبەدەستهێنانی زانیاریی لەسەر ئۆتیزم پاڵنەرێکی سەرەکی بوو، بۆ ئەوەی هەوڵ بدەین لە ئێستادا هیچ نەبێت کارێك بکەینو ئەم کتێبە وەك ڕێبەرێك لەبەردەستی خێزاندا بێتو سوودی لێ ببینێت، بەڵام لێرەدا ئەوە دەڵێین، بەهۆی ئاڵۆزی حاڵەتی ئۆتیزمو لەیەکنەچوونی منداڵانی ئۆتیزم لەیەکتر، بۆیە مەرج نییە، هەموو خێزانەکان وەك یەك سوود لەم کتێبە ببینن، بەڵام دڵنیام خێزانە بەڕێزەکان بەجۆرێك لەجۆرەکان سوودی لێ دەبینن، داواکارم لەخوای گەورە هاوکاری ئەو خێزانە بەڕێزانە بکاتو شیفای منداڵەکانیان بدات، ئێمە دەزانین ئەو خێزانانە لە چ بارودۆخێکی دەروونیی خراپدا دەژین. هیوادارین ئەو کەسانەی سوود لەم کتێبە دەبینن هیوای سەرکەوتنمان بۆ بخوازن و دوعای خێرمان بۆ بکەن، ئەگەر سوودیان لێ نەبینی ئەوە هیوادارین بمانبوورن.

ڕەحمان عەلی

# بەشی یەکەم

# ئۆتیزم چییە

ئۆتیزم ـ خود تەنیایی (التوحد) وەك هەر زاراوەیەکی تر چەندین پێناسەی هەیە، ئەمەش بەهۆی زیادبوونی ڕێژەی ئەم حاڵەتە لەهەموو دونیاو بەهۆی گرنگیدانی زیاتری زانایان بەم حاڵەتە، بۆیە هەر کەسەو بەپێی بیروبۆچوونی خۆی پێناسەی کردوە:

ئۆتیزم (وشەیەکی یۆنانییە بەمانای دابڕان و گۆشەگیری دێت) (حسن، ۲۰۱۲، لاپەڕە ۲٤۰).

(ئۆتیزم: بریتییە لەتێکچوونێکی ئاڵۆز لەپێشکەوتندا، لەسێ ساڵی یەکەمی تەمەنی منداڵدا دەردەکەوێت لەئەنجامی تێکچوونی فەرمانەکانی مێشك و دەمارەکان ) (الاحمد، ۲۰۰۵، لا ۱۳).

پێناسەی کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ ئۆتیزم ـ ۱۹۹۹

کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ ئۆتیزم (۱۹۹۹) بەم شێوەیە پێناسەی ئۆتیزم دەکات (بریتییە لەتێکچوونی گەشە کە لەسێ ساڵی یەکەمی تەمەنی منداڵدا دەردەکەوێت، لەئەنجامی تێکچوونە دەمارییەکان کە کار دەکاتە سەر فەرمانەکانی مێشك و لەئەنجامدا کار دەکاتە سەر زۆر لایەنی گەشەو دەبێتە هۆی

کەمی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، کەمی پەیوەندیی زارەکی و نازارەکی، ئەم منداڵانە وەڵامدانەوەیان بۆ شتەکان زیاترە لەوەڵامدانەوەیان بۆ کەسەکان، ئەم منداڵانە تێکدەچن بەهەر گۆڕانکارییەك کە لەژینگەدا ڕوویدات، ڕەفتارێکی جەستەیی دووبارەیان هەیە، یاخود بەردەوام هەندێ ڕستە دووبارەدەکەنەوە) (سلیمان، ۲۰۰۷، لا ۱۲).

لەئەنجامی ئەو پێناسانە دەتوانین بەم شێوەیە پێناسەی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی بکەین: بریتییە لەتێکچوونی گەشەی هەمە لایەنەی مێشك، کە کار دەکاتە سەر کارو فەرمان و چالاکییەکانی مێشك، لەسێ ساڵی یەکەمی تەمەنی منداڵدا دەردەکەوێت و لەسێ بواری سەرەکییدا کێشە بۆ منداڵ دروستدەکات، ئەو سێ بوارەش بریتییە لە:

١. نەبوون یان لاوازی پەیوەندیی زارەکی و نازارەکی.
٢. نەبوونی یان لاوازی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی.
٣. ڕەفتاری دووبارەو یەك ڕێچکەیی.

ئەو سێ خاڵەی سەرەوە، سێ نیشانەی سەرەکی منداڵی ئۆتیزمە بە پێی ڕێبەری دەستنیشان کردنی حاڵەتی ئۆتیزم، کە بە (DSM٥) ناسراوە، بەڵام لەهەمان کاتدا چەندین نیشانەی تر هەیە، کە لەمنداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر جیاوازە.

# نیشانەکانی ئۆتیزم

ئـــۆتیزم ـــ خـــود تـــەنیایی جیـــاوازە لەگەمئەندامـــە جەســـتەییەکان ، چـــونکە کەموکوڕییـــەکان لەمێـــشکدایەو بەهەڵسوکەوت دەردەکـەوێت, یـان لـە گـەڵ تەمـەن و گەشـەدا دەردەکەوێت، بۆیە زانایان چەند نیـشانەیەکی سـەرەکیان دانـاوە بۆ جیاکردنـەوەی منـداڵی ئۆتیزم لەمنـداڵانی ئاسـایی، بێگومـان ئـەم نیـشانەش بەئاسـانی بـۆ پـسپۆران دەرناکـەوێت، پێویـستە دەستنیشانکردنی حاڵەتی ئۆتیزم لەلایەن لیژنـەیەکی پـسپۆڕەوە بێت، لێرەشدا هێشتا ئاسان نییـە بـۆ لیژنەیـەك، کـە بتوانێـت بەخێرایی بڕیاربدات، کە ئەو منداڵە حاڵـەتی ئۆتیزمـە یـان نـا، چونکە زۆر حاڵـەتی تـر هەیـە، کـە ڕەنگـە نیـشانەکانی لەگـەڵ ئۆتیزم لەیـەك بـچن، وەك حاڵـەتی تێکچوونی گەشـەی گـشتیی دیاری نەکراو، کە زۆربەی نیشانەکانی لەئۆتیزم ئەچێت.

بەشێوەیەکی گشتی نیشانەکانی ئۆتیزم لـەدوای (١٨) مـانگی تەمـەنی منداڵـەوە دەردەکـەوێت، بـەڵام زیـاتر لـەنێوانی (٢ ـ ٣)ساڵی بەڕوونیو ئاشکرا دەردەکـەون، ئـەم گرفتانـە لەسـێ بـواری سەرەکیدا ڕوودەدات:

١. گفتوگۆ (ئاخاوتن): واتا منداڵی ئۆتیزم ناتوانێ پەیوەندیی لەڕێگەی قسەکردنەوە دروست بکاتو بەقسەکردن گوزارشت لەپێداویستییەکانی خۆی بکات.

٢. پەیوەندیی کۆمەڵایەتی: منداڵی ئۆتیزم ناتوانێت پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لەگەڵ هاوتەمەنی خۆیدا دروست بکات، بۆ نموونە کە یارییەکی بەگروپ دەکەن، هەر منداڵێك بۆ خۆی یاری دەکات، بێ ئەوەی بەشداری هاوڕێکانی بکات، یان وەڵامدانەوەی نییە لەکاتی بانگکردن بەناوی خۆیەوە.

٣. گرفت لەبواری ڕەفتاردا (هەڵسوکەوت): واتا ڕەفتاری دووبارەو یەك ڕێچکەیی، ئیتر ئەو ڕەفتار بریتی بێت لەیاری کردنێکی نادروست بەیارییەك، یان خولانەوەو جولەیەکی دووبارە (حسن، ٢٠١٣، لاپەڕە ٢٤٠).

## نیشانە سەرەکییەکانی ئۆتیزم - خود تەنیایی

بە پێی پێوەری (DSM ٥)ی ئەمریکی سێ نیشانەی سەرەکی بۆ ئۆتیزم دانراوە, ئەگەر دوو نیشانە لەو سێ نیشانەیە بوونی هەبوو, ئەوە ناوترێ ئەو منداڵە حاڵەتی ئۆتیزمی لە گەڵدایە, ئەوە پێی دەوترێ هەندێ لە نیشانەکانی ئۆتیزمی لە گەڵدایە, واتا دەبێت ئەو سێ نیشانەیە لە یەك کاتدا بوونی

هەبێت، بەڵام مەرج نیە ئەو سێ نیشانەیە لە هەموو منداڵاندا وەك یەك بێت، بەڵکو لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر جیاوازە، بە شێوەیەکی گشتی ئەو سێ نیشانەیە ئەمانەی خوارەوەن:-

## ١- نەبوون یان لاوازی پەیوەندیی زارەکی و نازارەکی (ئاخاوتن - گفتوگۆ):

لاوازی لەگوزارشتی زمانەوانی یان دواکەوتن لەقسە یان بەکارنەهێنانی پەنجەی ئاماژە، واتا هەندێ منداڵی ئۆتیزم - خود تەنیایی لایەنی ئاخاوتنی (قسەکردن)ی لاوازە، یان بەهیچ شێوەیەك بوونی نییەو تەنانەت زمانی ئاماژەش بەکارناهێنێت، ئەو منداڵانەی قسەدەکەن، هەندێ جار وشەی سەیر بەکاردێنن، کە هیچ مانایەکی نەبێت، یاخود وشەیەك یان ڕستەیەك دووبارە دەکەنەوە، کە گوێیان لێ بووە، یان هەندێ جار پڕوپاگەندەیەکی تەلەفیزیۆنی دووبارە دەکاتەوە، یاخود کێشەیان هەیە لە بەکارهێنانی جێناوەکاندا، بۆ نموونە لەبری ئەوەی بڵێت (دەمەوێت ئاو بخۆمەوە) دەڵێت: حەسەن دەیەوێت ئاو بخواتەوە (سایتی فەرمی د.رابیە الحکیم http://www.childguidanceclinic.com)، یاخود بەپێچەوانەوە کە شتێکی پێویست بێت، بەشێوەی پرسیار دەریدەبڕێت، بۆ نموونە دەڵێت (ئاو دەخۆیت)، یان هەمان

ڕستەی بەرامبەر دووبارە دەکاتەوە، منداڵی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی تێکچوون یان تەنگەژەیەکی هەیە لەتێگەیشتنی بۆ زمان، بۆیە لەگوزارەشتەکانی دەموچاو تێناگەن (الاحمد، ٢٠٠٥، لاپەڕە ٣٢ و ٣٣).

منداڵی ئاسایی لەتەمەنی ١٨ مانگیدا دەتوانێت بەپەنجە ئاماژە بۆ شتێکی تایبەت بکات، دەتوانێت بەئاماژەو هەندێ وشە گوزارشت لەهەڵچوونەکانی بکات، بێگومان ئەمەش پەیوەندیی چاوی لەگەڵدا دەبێت، بەڵام منداڵی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی ئەم توانایەی نییەو گوزارشتەکانی دەموچاوی لەگەڵ دەربڕینی هەستەکانی ناگونجێت، ئاماژەکانی لەگەڵ قسەکانی ناگونجێت (سلیمان، ٢٠٠٧، لاپەڕە ٢٤).

هەندێ جار منداڵی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی وشەیەك بەکاردێنێت، بەڵام ئیتر بۆ ماوەی هەفتەیەك یان مانگێك نایڵێتەوە یاخود بەپێچەوانەوە بەبەردەوامی دەیڵێتەوە، هەندێ پیت لای منداڵی ئۆتیزم دەربڕینی قورسە. لە ٥٠٪ منداڵانی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی توانای قسەکردنیان هەیە، بەشێوەیەك کە نیمچە تێگەیشتراو بێت. سەرەڕای ئەوەی کێشەیان هەیە لەگەڵ توانای زمانەوانی، بەڵام هەندێکی کەم لەمنداڵانی ئۆتیزم

ـ خودتەنیایی گەشەدەکەن لەپیتو ژمارەی نووسراودا (سلیمان، ٢٠٠٧، لاپەڕە ٢٧).

ئەو منداڵانەی فێری قسەکردن دەبن، دەبینین زۆر جار لەمانای وشەو ڕستەکان تێناگەن، بۆیە کە پرسیارێکی ئاراستە دەکەی هەمان پرسیاری تۆ دووبارە دەکاتەوە، بەهەمان دەنگو بەهەمان بەرزو نزمی دەنگ، یان هەندێك جار دوادەکەوێت لەوەڵامدانەوە، ڕەنگە دوای چەندین کاتژمێر هەمان پرسیار دووبارە بکاتەوە. منداڵی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی گوزارشتی دەم و چاوی نییە وەك منداڵی ئاسایی، ئەگەر ئەو گوزارشتانەش هەبێت، ئەوە ناتوانێت لەکاتی خۆیداو لەجێی خۆیدا دەری ببڕێت، ئەمەش بەپەیوەندیی نازارەکی دادەنرێت. (الجلبي، ٢٠٠٤، لاپەڕە ٣٥).

بەشێوەیەکی گشتی هەردوو پەیوەندیی زارەکیو نازارەکی لای منداڵی ئۆتیزم ـ خودتەنیایی بوونی نییە یان لاوازە، واتا ئەو منداڵانەی قسەدەکەن، قسەکردنەکەیان وەك منداڵێکی ئاسایی نییە، ئەمەش بەنیشانەیەکی سەرەکی لەنیشانەکانی ئۆتیزم ـ خودتەنیایی دادەنرێتو منداڵی ئۆتیزم لەمنداڵی ئاسایی جیادەکاتەوە، بۆیە لەکاتی ڕاهێناندا دەبێت گرنگی زیاتر

بەلایــەنی زمــان بــدرێت، بەتایبــەت دوای ڕاهێنــانی لایەنــە سەرەکییەکان، وەك توانستەکانی رۆژانە.

## ٢- نەبوون یان لاوازی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی:

مەبەســت لەپەیوەنــدیی کۆمەڵایــەتی گونجــانی منــداڵی ئۆتیزمــە لەگــەڵ دەوروبــەردا، ئــەم پەیوەندییــەش لای منــداڵ لەتەمەنێکی ساواییدا دروستدەبێت، بەتایبەت لەکاتی شیرپێدانی منــداڵ لەلایــەن دایکــەوە، بــەڵام ئــەم پەیوەندییــە لای منــداڵی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی بوونی نییە یان لاوازە ـ

-  . بــۆ نموونــە لەتەمــەنی منداڵیــدا، شــیرخواردن لەمــەمکی دایــك ڕەتدەکاتــەوە، کــە ئەمــەش نیــشانەیە بــۆ ڕەتکردنــەوەی پەیوەندیی لەگەڵ دایك.
-  . کاتێــك کەسێــك دەیــەوێت، هــەڵیبگرێت، دەســت نابــاتو وەڵامدانەوەی نییە.
-  . نەبوونی بزەی سەر لێو لەتەمەنی منداڵیــدا. (مــصطفی، ٢٠٠٨، لا ٢٧).
-  . نەبوونی پەیوەندی یــان نــەبوونی ئارەزوو لەپەیوەنــدی کردن لای منداڵی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی بەمنداڵانی هاوتەمــەنی خــۆی، یــاخود پاشەکــشەکردن لەبەســتنی هاوڕێیــەتی، پاشــان

بەکارنەهێنانی زمان لەپەیوەندیکردن بەکەسانی ترەوە (ارونز و جیتنس، بێ ساڵی چاپ، لا ٣٥). منداڵی ئۆتیزم لەدروستکردنی پەیوەندیی لەگەڵ ئەو کەسانەی خزمەتی دەکەن (واتا خێزان) سەرکەوتوو نابێت، بۆیە کاتێکی زۆر بەتەنیایی بەسەر دەبات، دەبینین لەهەموو تێکەڵبوونێك لەگەڵ دەوربەر دوور دەکەوێتەوە، هەندێ جار تووڕە دەبێت، کاتێك کەسێك بیەوێت لەگەڵی تێکەڵ ببێت، ناتوانێت لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا بەشداری بکات، ناتوانێت هاوسۆز بێت لەگەڵ بیروبۆچوون‌و هەستی دەوروبەری، ناتوانێت هاوکاریی پێشکەش بکات، ناتوانن گفتوگۆ دروستبکەن (محمد، بێ ساڵی چاپ، ٢٣ و ٢٤). لێرەشەوە گرنگی پەیوەندیی زارەکی‌و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لەوەدا دەردەکەوێت، کە هەردووکیان تەواوکەری یەکترن‌و بەنەبوونی یەکێك لەو دوو پەیوەندییە، ئەوە ئەوی تر ناتەواو دەبێت، بۆیە پێویستە لەڕاهێناندا پەیوەندیی کۆمەڵایەتی‌و تێکەڵکردنی منداڵانی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی بەهەند وەربگیرێت‌و ئیشی لەسەر بکرێت.

### ٣-هەڵسوکەوتی دووبارەو یەکرێچکەیی:

ڕەفتاری دووبارەو یەکرێچکەیی یەکێکی ترە لەنیشانە سەرەکییەکانی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی، بۆ نموونە جووڵەی

دووبارەی لەش باڵەفرکە یان سەرخولانەوە یاخود خولانەوە بەدەوری خۆی، بێ ئەوەی هیلاك بێت یان یاری کردن بەدەستەکانی (النجار، ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٦).

دووبارەکردنەوەی یارییەکی تایبەت تا ماندوو دەبێت، یاری کردنەکە بەشێوەیەکی یەکرێچکەیی دەبێت، لەچوارچێوەیەکی تایبەت و بەهەموو شێوەیەك دژی گۆڕانکاری دەوەستێت، یان هەندێ جار تەنها یاری بەبەشێکی یارییەکە دەکات (الاحمد، ٢٠٠٥، لاپەڕە ٤٤).

منداڵی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی وەك منداڵی ئاسایی بۆ شتی تازە ناگەڕێت، بەشێوەیەکی سروشتی یاری لەگەڵ شتەکاندا ناکات (سلیمان، ٢٠٠٧، لاپەڕە ٢٨). بێگومان ئەم ڕەفتارە دووبارەو یەکرێچکەیە لەپەیوەندیی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیی زارەکی و نازارەکی دووری دەخاتەوە، لەهەمان کاتدا کێشەی بۆ دروستدەکات لەگەڵ دەوروبەرو دەبێتە گرفت لە بەردەم پرۆسەی فێرکردندا.

هەندێ کەس زیاتر لەنیشانەیەك بۆ منداڵی ئۆتیزم دادەنێن، یان منداڵی ئۆتیزم مەرج نییە، تەنها ئەو سێ نیشانەیەی سەرەوەی هەبێت، هەندی نیشانەی هەڵسوکەوتی تر هەیە، کە منداڵی ئۆتیزمی پێدەناسرێتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا مەرج نییە، ئەو نیشانانە لەهەموو منداڵانی ئۆتیزم وەك یەك

بێـت، گـرنگترین ئـەو نیـشانە هەڵـسوکەوتیانە، ئەمانــەی لای خوارەوەمیە:

١- یـاریکردنی یەکرێـچکە، نـەبوونی خـەیاڵ لەیاریکردنـدا، بەکارنەهێنانی یاری داهێنان یان داهێنان ناکات لـە یاریکردنـدا، یاریەکانی یاری دووبارەو یەکرێچکەیە.

٢- نەبوونی تێڕوانین بەچاو (سەیرکردنی بەچاو).

٣- دژی گۆڕانکارییـەکان دەوەسـتێت، کاتێـک هـەوڵ بـدرێت، گۆڕانکارییەك لەیارییەکەیدا بکرێـت، یـان ڕێنمـایی بکرێـت، زۆر بەتوندی تووڕە دەبێتو ڕەتی دەکاتەوە.

٤- گۆشەگیری کۆمەڵایەتی، تێکەڵبوونو مامەڵەکردن لەگەڵ خێزانەکەیو کۆمەڵگا ڕەتدەکاتەوە، حەزنەکردن بەباوەشکردنی.

٥- یـاریکردن بەتـەنهاو حـەز نـەکردن بـەیاریکردن لەگـەڵ هاوتەمەنەکانی خۆی. یاریکردن بەشێوەیەکی سـەیرو یـاریکردن بەبەشێکی بچووکی یارییەکە (واتە گـەر یـاری بکـات ئۆتـۆمبیلی منداڵان بکات، تەنها یاری بەتایەکانی دەکاتو دەخولێنێتەوە).

٦- سستی یان جوڵەیەکی زۆر بەبێ ئامانج.

٧ - پشتگوێخستنی دەوروبەر بەشێوەیەك، کـە گومـان بکـەن نابیستەو توانای قسەکردنی نییە.

٨- بێدەنگیەکی تەواو یان هاوار کردنو گریـانێکی بـەردەوام بەبێ هیچ هۆیەك.

٩- پێکەنینێکی بێ هۆ.

١٠- نەبوونی سەیریکردنی چاو بۆ دەوروبەر.

١١- قورسی لەتێگەیشتن لەزمانی ئاماژەو کێشە لەتێگەیشتن لەشتە بینراوەکان .

١٢ - دواکەوتنی هەستەکانی (دەستلێدان و بۆنکردن و تامکردن و بیستن و بینین).

١٣- هەستنەکردن بەسەرماو گەرما .

١٤- ترس لەدەنگی بەرز.

١٥- ترس یان نەترسان (لەمەترسییە ڕاستەقینەکان).

١٦ - کێشەی سۆزداری و کێشە مامەڵەکردن لەگەڵ دەوربەردا. (الاحمد، ٢٠٠٥، لاپەڕە ١٨).

منداڵی ئۆتیزم لەڕووی جەستەییەوە، هیچ کەموکورییەکی نییە، کە لەمنداڵی ئاسایی جیای بکاتەوە (سلیمان، ٢٠٠٧، لاپەڕە ١٧)، ئەو نیشانانە نەبێت، کە لەمامەڵەکردن و ڕەفتاری ڕۆژانە دەردەکەوێت. زۆر نیشانەی تر هەیە، کە منداڵی ئۆتیزم لەمنداڵی ئاسایی جیابکاتەوە، بۆ نموونە (منداڵی ئۆتیزم ناتوانێت داوای هاوکاری بکات لەکەسانی تر لەکاتی ئازار یا لەکاتی پێویستدا، واتا لەکاتی کەوتن و ئازار بەرکەوتن ناڕوات بۆ لای دایك و باوکی تا ئاگاداریان بکاتەوە (الاحمد، ٢٠٠٥،لاپەڕە١٩).

واتا منداڵی ئۆتیزم ـ خودتەنیایی وەك منداڵی تر پەیوەندیی زارەکیو نازارەکی نییە، لەهەمان کاتدا ناتوانێت پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لەگەڵ هاوتەمەنی خۆیدا دروست بکات، ڕەفتاری دووبارەبوونەوە زۆر ڕەفتار دەگرێتەوە، ئەم ڕەفتارەش لەمنداڵێکی ئۆتیزمەوە بۆ منداڵێکی تر دەگۆڕێ، بۆ نموونە هەندێ منداڵ خو بەیاریکەوە دەگرێتو بۆ هەر کوێ بڕوات، دەبێت ئەو یارییە لەگەڵ خۆیدا ببات، یاخود خوولانەوەو جوڵەیەکی زۆر ، بێگومان چەندین ڕەفتاری هەیە، کە بەڕەفتاری دووبارە ناودەبرێت.

جگە لەو نیشانانەی سەرەوە باسمان کرد، چەندین نیشانەی تر هەیە، کە منداڵی ئۆتیزم جیادەکاتەوە لەمنداڵانی تر، یان بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین، منداڵی ئۆتیزم کێشەی لەپێنج هەستەکەیدا هەیە، کە زیاتر خێزان بەدی دەکاتو دەتوانێت پەنجە بخاتە سەر خاڵە لاوازەکانی.

# دەستنیشانکردنی ئۆتیزم

دەستنیشانکردنی حاڵەتی ئۆتیزم جیاوازە لەحاڵەتەکانی تری کەمئەندامی، چونکە حاڵەتی ئۆتیزم لە حاڵەتە عەقلیە ئاڵۆزەکانە، بۆیە پێویستە بەچەند قوناغێك ئەم حاڵەتە دەستنیشان بکرێت، کە دەبێت لەلایەن لیژنەیەکی پسپۆڕەوە بێت، ئەمەش وای کردوە، ئۆتیزم بەئاسانی دەستنیشان نەکرێتو پسپۆڕانی بواری منداڵان لەم ڕووەوە کێشەی گەورەیان هەبێت، هەر بۆیە هەندێ جار دەستنیشانکردنی منداڵێك بەحاڵەتی ئۆتیزم ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت.

لەوڵاتانی ڕۆژئاوا دوای تەمەنی (١٨) مانگی منداڵی ئۆتیزم دەستنیشان دەکرێت، ئەوەش بەگرتنبەری چەند ڕێگایەك یاخود چەند تاقیکردنەوەیەك، کە لەجیهاندا پشتی پێدەبەسترێ بۆ دەستنیشانکردنی حاڵەتی ئۆتیزم هەردوو تێستو پێوانەکاری (ADI و ADOS) و پێوانە چات بۆ ١٨ مانگی دانراوە (سایتی فەرمی، د.رابیە الحکیم www.childguidanceclinic.com ).

# قۆناغەکانی دەستنیشان کردنی حاڵەتی ئۆتیزم

* دەستنیشانکردنی پزیشکی: وەرگرتنی چەندین زانیارییە دەربارەی منداڵ، لەکاتی بوونی لەسکی دایكو کاتی لەدایکبوونو گەشەو جووڵەی.... هتد دەگرێتەوە، پاشان ئەنجامدانی چەند شیکارییەك، کە پزیشك دەستنیشانی دەکات، هەروەها هێڵکاری مێشكو تیشکی ڕەنینی مغناتیسی مێشك.

* ڕەفتار: ئەمەش بەتێبینی کردنی ڕەفتاری ڕۆژانەی منداڵەکە چی لەناو خێزاندا یان لەسەنتەرێکی تایبەت، یان هەر جێگایەك کە ئەو منداڵە تێیدا دەبێت.

* حاڵەتی دەروونی: ئەمەش بەبەکارهێنانی کۆمەڵێك پێوەر لەڕووی درك پێکردنو لایەنی کۆمەڵایەتیو هەڵچوونو گونجانی لەگەڵ دەوروبەردا.

* هەڵسەنگاندنی پەیوەندی: هەڵسەنگاندنی پێنج هەستەکە دەگرێتەوە، هەڵسەنگاندنی ماسولکەی بچووكو ماسولکەی گەورەو بەکارهێنانیان بەشێوەیەکی دروست.

* هەڵسەنگاندنی لایەنی زانستی: تواناکانی پێش قوتابخانە وەك (ناسینی ڕەنگەکان، پیتەکان، شێوەکان)، تواناکانی قوتابخانە (وەك خوێندنەوەو ژماردن)، تواناکانی ڕۆژانە وەك (نانخواردن، جل لەبەرکردن، چوونە توالێت W.C).

* هەڵسەنگاندنی وەزیفی: ئەمەش لەڕێگەی کۆمەڵێک ئەزموونی مەنهەجی، تێبینی، هەڵسەنگاندن، گفتوگۆ لەگەڵ دایکو باوک، ئەمەش بۆ گەیشتن بەهەڵسەنگاندنی تواناکانی پەیوەندی. (سلیمان، ٢٠٠٧ ، لاپەڕە ٥٥ – ٥٧).

ئەمەو هێشتا لەدونیادا دەستنیشانکردنی ئۆتیزم ئاسان نییە، لەزۆر وڵاتدا دەستنیشانکردن نزیکەی شەش مانگ یان زیاتر دەخایەنێت، لەئیستاشدا لەکوردستان دوو لیژنەی سەرەکی هەیە، ئەوانیش لەشارەکانی هەولێر سلێمانییە، کە بریتییە لە(پزیشکێکی دەروونیو پزیشکێکی منداڵانو تویژەرێکی دەروونیو توێژەێکی کۆمەڵایەتیو مامۆستای پەروەردەی تایبەت). هەر چەندە دەستنیشانکردنی منداڵی ئۆتیزم کەموکوری تێدایە لەکوردستاندا، بەڵام توانراوە، کەم تا زۆر ئەو منداڵانە دەستنیشان بکەن، کە گومانی ئۆتیزمیان لێ دەکرێت، ئەمەش هاوکارە بۆ ئەوەی کە بێگومان ئەو منداڵانە دواکەوتنیان هەیەو پێویستیان بەڕێنمایيو چارەسەر هەیە، ئەگەر ئۆتیزمش نەبن، ئەمەش وادەکات خێزان هەنگاوی پێویست بنێت بۆ هاوکاری کردنی منداڵەکەی.

# پێوەری دەستنیشان کردنی حاڵەتی ئۆتیزم

## Diagnostic and Statistical Manual of Mental Disorders, Fourth Edition(DSM٤)

لە سەرەتای دۆزینەوە یان ناونانی حاڵەتی ئۆتیزم چەندین پێوەر دروست بوو بۆ دەستنیشان کردنی ئەم حاڵەتە، لە زۆر وڵاتدا پێوەری تایبەت بە خۆیان هەیە بۆ دەستنیشان کردن، پێوەری (DSM٤) گرنگترین پێوەرە کە لە زۆربەی وڵاتان پشتی پێ دەبەسترێ و بۆ دەستنیشان کردنی حاڵەتی ئۆتیزم بە کاردێت، ئەم پێوەرەش لە پێوەری یەك دەستی پێکرد و ئێستاش پێوەری چوار ئەو پێوەرەیە کە بە کار دێت بۆ دەستنیشان کردن، ئەم پێوەرە چەند ساڵ جارێك کۆمەڵێك گۆڕانکاری بە سەردا دێت و بە شێوازێکی نوێوە دەخرێتە بەر دەستی پسپۆڕان بۆ دەستنیشان کردنی حاڵەتی ئۆتیزم.

ڕێبەری دەستنیشان کردنی حاڵەتی ئۆتیزم ( DSM٤) لە لایەن ڕابیتەی پزیشکی دەروونی ئەمریکیەوە دانراوە، بە پێی ئەم ڕێبەرە ئۆتیزم یەکێکە لە شێوەکانی تێکچوونی گەشەی گشتی، ( ١٦ ) شانزە پێوەر دانراوە بۆ دەسنیشان کردنی ئۆتیزم، لە سێ بواری سەرەکییدا:

١- لاوازی لە چەندێتی و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی.
٢- لاوازی لە چەندێتی و چۆنێتی پەیوەندیکردن و بەردەوام بوون.
٣- بایەخدان چالاکی دووبارە (خطاب/٢٠٠٥/لاپەڕە ٥٣-٥٦)

بە پێی ڕێبەری دەستنیشان کردنی ئۆتیزم (DSM٤)دەبێت بە لایەنی کەم شەش نیشانەی لەو نیشانانەی خوارەوە هەبێت، دەبێت لە کۆی (١٢) خاڵ بەلایەنی کەمەوە (٦) نیشانە یان شەش خاڵ لە منداڵدا هەبێت بۆ ئەوەی دڵنیابین لەوەی کە ئایە ئۆتیزمە یان نا, بەلام دەبێت لەو شەش نیشانەیە بەلایەنی کەم (٢) نیشانەی لە خانەی (A) بێت و (١) نیشانەش لە لە خانەی (B)و (١) نیشانەی لە خانەی (C)، واتا نابێت کۆی ئەو شەش نیشانەیە تەنها لە دوو خانە بێت، ئەگەر هاتوو منداڵێك شەش نیشانەی لە (A,B) هەبوو ئەوە ڕەنگە حاڵەتێکی تری لە گەڵدا بێت نەك ئۆتیزم (حسن/٢٠١٢/لاپەڕە ٢٤٤) و (خطاب/٢٠٠٥/لاپەڕە ٥٥-٥٦)

## خشتەی پێوەری (DSM٤) بۆ دەستنیشان کردنی حاڵەتی ئۆتیزم:

| | نیشانەکان | | | |
|---|---|---|---|---|
| A | لاوازی لە چەندێتی و هەڵسوکەوتی کۆمەلایەتی | بەڵێ | نەخێر | نازانم |
| ١ | ئایە گرفتی دەربڕینەکانی دەم و چاو،باری جەستە، ولام نەدانەوەی سۆز بەرامبەر پێکەنینی یان توڕەبوونی دایك هەیە؟ | | | |
| ٢ | ئایە گرفتی هەیە لە دروست کردنی پەیوەندی لە گەڵ هاوتەمەنەکانیدا ؟ | | | |
| ٣ | ئایە کەمی بایەخدان و هەوڵدانی هەیەلە بەشداری کردن لە یاریدا (نەتوانینی هێنانی یارییەك یان داوا کردنی یان ئیشارەت کردن بۆ یارییەك ؟) | | | |
| ٤ | ئایە کەمی یان نەتوانین گۆڕینەوەی هەست و سۆزی هەیە لە گەڵ چواردەوردا ؟ | | | |
| B | لاوازی لە چەندێتی و چۆنێتی پەیوەندیکردن و بەردەوام بوون | بەڵێ | نەخێر | نازانم |
| ١ | ئایە دواکەوتن یان لاوازی توانای گفتوگۆی (نەتوانینی جێگرتنەوەی بە بەکارهێنانی شێوازێکی تر ) هەیە؟ | | | |
| ٢ | ئایە لە حاڵەتی توانینی قسە کردندا ناتوانێت دەستپێشخەری بکات و بەردەوام بێت لە گفتوگۆ؟ | | | |
| ٣ | ئایە دووبارەکردنەوەی هەمان ووشە یان ڕستە ( دەشێ زمانی تایبەت بێت بە خۆی ) هەیە ؟ | | | |
| ٤ | ئایە گرفتی هەیە لە گۆڕانکاری لە یارییەکان و لە ئاسایی کردنەوەی کەسانی ترو گرفت لە یاری کردن لە گەڵ هاوەڵەکانیدا؟ | | | |

| C | بایەخدان چالاکی دووبارە | بەڵێ | نەخێر | نازانم |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئایە خۆ ماندووکردن بە یاریەکی دیاری کراوە یان یاری کردن بە یارییەك بە شێوەیەکی زۆر سنوردار و ناسروشتی و جەختکردنەوە لە سەر چەند بارەکردنەوەی هەیە؟ | | | |
| ٢ | ئایە بەرەنگاربوونەوەی گۆڕانکاری لە یاری و کەل و پەلی تایبەتی خۆی دەفر(دەوری ) یان کەوچك یان پەرداغ هەیە؟ | | | |
| ٣ | ئایە چەند بارە کردنەوەی جوڵەی لەش بەتایبەتی پەلەکان، | | | |
| ٤ | ئایە سوربوون لە سەر بایەخدان بە بەشێکی بچووکی ئەو یارییە هەیە ؟ | | | |
| | کۆی گشتی / | | | |

( حسن/٢٠١٢ / لاپەڕە ٤٤٥-٤٤٦ ) ژمارەی خاڵی کۆکراوەی سەرەوە ڕێژەی ئۆتیزم لای منداڵ دەردەخات، ئەوەش لە نێوان (توند، مام ناوەند، سادە) ئەم سێ جۆرەش لە خەسڵەت و نیشانەکاندا لە یەك جیاوازن و بە پێی ئەو ڕێژەییە دەبێت بەرنامە بۆ منداڵی ئۆتیزم دابنرێت و مامەڵەی لە گەڵدا بکرێت.

زۆر جار کێشەی گەورە دێتە ڕێگەی پسپۆڕان و پزیشکی تایبەت بە منداڵان یان پزیشکی دەرونی لەدەست نیشان کردنی منداڵی ئۆتیزم، ڕەنگە هەندێ جار لیژنەی پسپۆڕیش بە هەڵەدا بچن لە دەستنیشان کردنی حاڵەتی ئۆتیزم، ئەمەش هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئۆتیزم بە ئاسانی دەرناکەوێت و زۆر جار نیشانەکانی لە گەڵ هەندێ حاڵەتی تردا تێکەڵ دەبێت، یان دەتوانین بڵێین

زۆر حاڵەت هەیە کە ڕەنگە لە هەندێ نیشانە لە ئۆتیزم بچێت بەڵام ئۆتیزم نیە, ئەمەش لە زۆر جێگادا روو دەدات چونکە ئۆتیزم بە حاڵەتێکی ( نادیار غامض) ناو دەبرێت.

١ بێدەنگی ( قسە نەکردنی هەڵبژێردراو- الصم الاختیاری- Elective Mutism) لەم حاڵەتە منداڵ قسە کردن و پەیوەندی لە گەڵ دەوروبەردا لە هەندێ کات رەت دەکاتەوە.

٢- قورسی یان گرانی پەیوەندی سۆزداری ( صعوبات الارتباط العاطفی- Attachment Disorder) لەم حاڵەتدا منداڵ ناتوانێت گەشە بە پەیوەندیە عاتفیەکانی لە گەڵ دایك و باوکدا بدات, ڕەنگە بە هۆی هەندێ کێشەی خێزانەوە بێت وەك کەمی سۆزو خۆشەویستی لە لایەن دایك و باوکەوە.

٣- قورسی یان گرانی زمانی گەشەیی ( صعوبات اللغة النمائیة- Developmental Language Disorder) گەشەی زمان لای منداڵ دوادەکەوێت و کاریگەری دەبێت لە سەر پەیوەندی کۆمەڵایەتی.

٤- بیرکۆڵی ( العوق العقلی- Mental Handicap) حاڵەتە عەقڵیەکان- ژیرییەکان جۆریان زۆرە کە لە هەندێ نیشانەدا لە حاڵەتی ئۆتیزم دەچن.

٥- هەندێ ڕەفتاری ڕێچکەیی کە لە ئۆتیزم دەچێت ( انماط سلوکیة شبیهة بالتوحد- Autism Like) بە تایبەت حاڵەتی ئۆتیزمی نا ڕێچکەیی (التوحد غیر النمطي – Atypical Autism) ئەم حاڵەتەش پێش سێ ساڵی تەمەنی منداڵ دەرناکەوێت، بە پێچەوانەی حاڵەتی تەنگەژەیی ئەسپێرجەر کە لە رویی زمان و توانا عەقلییەکانەوە تارادەیەك کێشەی نیە، بەڵام کێشەی لە پەیوەندی و تێکەڵ بوونی کۆمەڵایەتییدا هەیە.

٦- هەندێ حاڵەتی تر هەیە کە لە هەندێ نیشانە و خەسڵەتدا لە ئۆتیزم دەچن، ئەو حاڵەتانەش بریتیە لە:

A کۆنیشانەی ڕێت (متلازمة ریت - Retts Syndrome) ئەم جۆرە تووشی کچ دەبێت، بریتیە لە هەندێ کێشەی دەماری ( عصبیة) لە نیشانەکانی یاری کردن بە دەست و پەنجەکان بە شێوەیەکی نامۆ.

B- گەڕانەوەی گەشە( انتکاس النمو- Disintegrative Diorder ) لەم حاڵەتەدا منداڵ بەرەو دواوە دەروات دوای

ئەوەی زۆر بە سروشتی گەشەی کردبوو، واتا لە زۆربەی تواناکاندا بەرەو دواوە دەڕوات لە بری ئەوەی بۆ پێشەوە بڕوات و گەشە بکات.

C- گرانییەکانی فرە جوڵەیی دووبارە ( صعوبات الفرط الحركي التكراري- Hyperkinetic Disorder with Sterotypies ) فرە جوڵەیی لای منداڵ دەبێتە هۆی کەمی هۆشداری و نەتوانین لە ئەنجامدانی کارو چالاکی، کە بەردەوام لە جوڵەدایە. النجار/٢٠٠٦/ لاپەڕە ( ٦٠،٦١

ڕەنگە زۆر حاڵەتی تر هەبن لە حاڵەتی ئۆتیزم بچن، ئێمە لێرەدا ئاماژەمان پێ نەدابێت، بەڵام ئەوەی گرنگە پسپۆران و ڕاهێنەران بیزانن ئەوەیە هەموو ئەو حاڵەتانە بە خاوەن پێداویستی تایبەت دادەنرێت و پێویستی بە مامەڵە و بەرنامەی تایبەت هەیە.

# جیاوازی نێوان منداڵی ئۆتیزم و منداڵی ئاسایی

لەم خشتەیەدا جیاوازی لە نێوان منداڵی ئۆتیزم و منداڵی ئاساییدا دەخەینە روو لە رووی گەشەو پەیوەندی (واتا زمان) و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و دۆزینەوەی ژینگە واتا گەران بە دوای دەورویەردا و شتەکاندا

## خشتەی جیاوازی نێوان
## منداڵی ئۆتیزم و منداڵی ئاسایی

| منداڵی ئۆتیزم | منداڵی ئاسایی |
|---|---|
| پەیوەندی<br>١ لە پەیوەندی چاو دور دەکەونەوە<br>٢-وەك نابیستە دەردەکەون<br>٣-گەشەی زمانیان هەیە لە ماوەیەکی کەمداو لە پڕێکدا لە قسە کردن دەکەون | پەیوەندی<br>١-لە دەموچاوی دایکیان دەکۆڵنەوە<br>٢-دەنگەکان بەبەردەوامی دەیانوورژێنن<br>٣-بەردەوام وشەی تازە فێر دەبن و گەشە دەکەن لە بەکارهێنانی رستە |
| پەیوەندی کۆمەڵایەتی<br>١-بەشێوەیەك هەڵسوکەوت دەکەن کە درك بە هاتن و رۆشتنی کەسەکان | پەیوەندی کۆمەڵایەتی<br>١-دەگرین کاتێك دایکیان بە جێیان بهێڵێت , لە کەسە نامۆکان دەترسن |

| | |
|---|---|
| نەکەن<br>٢-هێرش دەکەنە سەر کەسەکان بێ ئەوەی بیانورژێنن یان شەڕیان پێ بفرۆشن<br>٣-وەك ئەوەی لە شوێنێکی داخراو بن لە کۆمەڵگە، بۆیە تێکەڵ بوون لە گەڵیاندا قورسە. | ٢-تورە دەبن کاتێك برسیان دەبێت یان هیلاك دەبن<br>٣-دەموچاوە ناسراوەکان دەناسنەوە و دوای دایکیان دەکەون. |
| دۆزینەوەی ژینگە<br>١-لە سەر یەك جوڵەو یەك چالاکی بەردەوام دەبن<br>٢-جوڵەو چالاکی سەیر ئەنجام دەدەن وەك جوڵاندنەوە و یاری کردن بە دەستەکانیان و چەپڵەلێدان<br>٣-یاری لە ڕێگەی تام کردن و بۆن کردن دەدۆزنەوە<br>٤-درك کردن بە سوتاندن و شوێنی بەرکەوتن دەرناخەن، ڕەنگە بە گاز گرتنی توند ئازاری خۆیان بدەن | دۆزینەوەی ژینگە<br>١-بە هیلاکی لە چالاکییەکەوە بۆ چالاکییەکی تر دەڕۆن<br>٢-جەستەیان بە کاردێنن بۆ گەیشتن بۆ جێگایەك یان شتێك<br>٣-یاریەکان دەدۆزنەوە و یاری پێ دەکەن<br>٤-بە دوای خۆشییدا دەگەڕێن و هەست بە ئازار دەکەن |

(نصر/٢٠٠٢/ لاپەرە ٦١,٦٢ )

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە منداڵی ئۆتیزم لە یەك لایەندا کێشەی نیە، بە پێچەوانەوە لە زۆر لایەن کێشەی هەیە، وەك پەیوەندی، پەیوەندی کۆمەڵایەتی، یاری خەیاڵی، درك پێکردن .... تادوای، بەڵام ئەو خاڵانەی لە سەرەوە بۆ منداڵی ئۆتیزم

دانراوە مەرج نیە هەمووی لە منداڵێکی ئۆتیزمدا کۆ ببێتەوە و هەبێت، یاخوا مەرج نیە هەموو ئەو خاڵانە وەك جۆن ئاماژەی پێکراوە بوونی هەبێت، ڕەنگە بە شێوەیەکی جیاواز لە منداڵێکدا هەبێت، بۆیە نابێت خێزان بە بینینی ئەو خاڵانە یەکسەر بڕیار بدات کەوا منداڵەکەی حاڵەتی ئۆتیزمی هەیە، ئەو بەراودە تەنها بۆ ئەوەیە جیاوازی بکرێت لە نێوان منداڵێکی ئاسایی و منداڵێکی ئۆتیزم، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو جیاوازییەوە بتوانرێت هاوکاری منداڵی ئۆتیزم بکرێت.

## گەشەی سروشتی منداڵ

منداڵ لە گەڵ تێپەڕبوونی تەمەن هەموو لایەنەکانی گەشە دەکات، واتا تەنها لە رووی جەستەییەوە گەشە ناکات، بەڵکو لە لایەنی هەستیاری و زمان و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و زۆر لایەنی تر گەشە دەکات، بەڵام منداڵانی خاوەن پێداویستی تایبەت لەم روەوە کێشەیان هەیە، هەندێ منداڵ لە رووی جستەییەوە گەشەی دوا دەکەوێت، هەندێ منداڵ لە لایەنی کۆمەڵایەتی و زمان و توانای رۆژانە و... هتد دوا دەکەوێت، ئەمەش گرفتێکی گەورەیە کە تووشی خێزان دەبێت، چونکە ئەم دواکەوتنانە زۆر جار خێزان بە هەڵەدا دەبات، بۆ نموونە دواکەوتنی زمان زۆر جار ئەو حاڵەتە لای خێزان دروست دەکات کە ئەو منداڵە ئاساییە و هیچ کێشەیەکی نیە و تەنها زمانی قسە کردنی دوا کەوتووە، ئەمە و چەندین بیرکردنەوەی تر کە دەبێت هۆی درەنگ دەرکەوتن و دەستنیشان کردنی حاڵەتەکە، بۆیە لێرەدا گەشەی ئاسایی منداڵ دەخەینە روو تا خێزان بزانێت

منداڵەکەی لە چی لایەنێکەوە دواکەوتووە, یان خێزان دەتوانیت لە هەڵسەنگاندنی منداڵەکەیدا بزانێت منداڵەکەی لە چ ئاستێك یان چ تەمەنێك دایە, چونکی زۆر جار تەمەنی ئاسایی منداڵ لەگەڵ تەمەنی عەقڵیدا جیاوازی هەیە, ئەم خشتەیەی خوارەوە گەشەی ئاسایی منداڵ دەردەخات:

| تەمەن | هۆشی و هزری | پەیوەندی | گەشەی جوڵەیی | گەشەی کۆمەڵایەتی | چاودێری خود |
|---|---|---|---|---|---|
| لە تەمەنی لەدایک بوونەوە تا ٣ مانگ | -وەڵامدانەوەی دەبێت بۆ دەنگە تازەکان<br>-سەیری جوڵەی دەستەکان دەکات<br>-سەیری خەڵک و شتەکان دەکات | -دەندەنە دەکات و دەنگ دەر دەکات<br>-زەردەخەنەی دەبێت بۆ دەنگی دایکی | -دەست و قاچی دەجوڵێنێتەوە<br>- شت دەگرێت یان هەڵی دەدات<br>-چاودێری جوڵەی دەستەکانی دەکات | -چێژ لە یاری و باوەش دەبینێت<br>-پەیوەندییەکی چاوی کورت دروست دەکات لە کاتی شیر خواردن | - دەم دەکاتەوە بۆ شووشەی شیر یان مەمکی دایکی و شیر دەخوات |
| لە ٣-٦ مانگ | -ترپە بە دایکی دەکات<br>دەگاتە شتەکان | -سەیری دەجوڵێنێتەوە بۆ دەنگ و قسەکان<br>-دەست دەکات بە گڕوگاڵ<br>-لاسایی دەنگەکان دەکاتەوە<br>-گریانەکانی چەند جۆرێک دەکات | -سەرو سنگی بەرز دەکاتەوە<br>-لە شتەکان دەدات لە کاتی یاری کردندا | -تێبینی کەسە نامۆکان و شوێنەتازەکان دەکات<br>-گوزارشت لە خۆشی و گرژی یان بێزاری و رق دەکات<br>-حەز بە یاری جەستەیی دەکات | -خواردنی ساوایی بە کەوچک دەخوات<br>- دەگاتە شوشەی شیرەکە و دەیگرێت |
| لە ٦-٩ مانگ | -لاسای ئاماژە سادەکان دەکاتەوە<br>-وەڵامدانەوەی دەبێت بۆ ناوی خۆی | - برگەیەک دەنگ دەردەکات کە هیچ مانایەکی نیە<br>-دەنگ بە کار دێنێت تا ئاوڕی لێ بدەنەوە | -گاگۆڵکێ دەکات<br>- بە پاڵپشتی شتەکان دەوەستێت<br>-چەپڵە لێ دەدات<br>-شتێك لەم دەست دەگوازێتەوە بۆ ئەو دەست | -یاری چاوشارکێ دەکات<br>-چێژ لە منداڵانی تر دەبینێت<br>-لە نامۆکان | -خواردن قوت دەدات<br>- بە یارمەتی ئاو لە کوپ دەخواتەوە |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| لە ۹-۱۲ مانگ | -یاری تۆپێن یان هەندێ یاری سادە دەکات<br>-دەجوڵێتەوە تا بگاتە ئەو شتانەی باو و خۆشەویستە لای<br>-سەیری وێنە دەکات لە کتێبدا | -بە دەستی ئاماژەی خواحافیزی دەکات.<br>-دەوەستێت کاتێک پێی دەوترێ (نا)<br>- لاسایی دەنگە تازەکان دەکاتەوە | -بە دەست گرتن بە دیوارو کورسیەکان دەڕوات(ڕێگا دەکات)<br>-بە قەڵەم ڕەساس یان قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگ هەندێ نیشانە دەکات<br>-بیر لەو شتانە دەکاتەوە کە لەبەر چاوی وون دەبن | -بە دەنگێکی بیستراو پێدەکەنێت لە کاتی یاریدا<br>-هەندێ شت پێش شتێکی تر دەخات (ویستراوتر- تفضیل )<br>-وەلامدانەوەی هەیە بۆ گۆڕانکاری لە مەزاجی دەوروبەردا | -بە پەنجەکانی خۆی نان دەخوات<br>- خۆی بە پەرداخ ئاو دەخواتەوە |
| لە ۱۲-۱۸ مانگ | -لاسایی دەنگ و ئاماژەی<br>-ئاماژە دەکات بۆ ئەو شتەی کە دەیەوێت یان حەزی لێیە | - دەست دەکات بە بەکارهێنانی ووشە<br>-هەندێ فەرمانی سادە جێبەجێ دەکات<br>-سەری دەجوڵێنێتەوە وەك ئاماژەیەك بۆ ڕەتکردنەوە | - بە تەنها بە قادرمەدا سەردەکەوێت<br>- قاڵبەکان کۆ دەکاتەوە | -دووبارە کردنەوەی کارێك پێدەکەنێت<br>- گوزارشت لە هەڵچوونەکانی دەکات وەك ترس یان تووڕە بوون<br>-ماچی کەسانی تر دەکاتەوە یان باوەشیان پێدا دەکات<br>کاتێك ماچی بکەن یان باوەشی پێدا بکەن بە تایبەت دایك و باوك | - دەجوڵێتەوە بۆ ئەوەی دایکی بە ئاسانی جلەکانی لە بەر بکات<br>-دایکی ئاگادار دەکاتەوە ئەگەر داییبەکەی یان جلی ژێرەوەی تەڕ بوو |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| لە ١٨-٢٤ مانگ | -بەشەکانی جەستەی دیاری دەکات<br>-ئاوڕ دەداتەوە بۆ هەندێ دەنگی ئیقاعی<br>-ئاماژە بۆ وێنەکانی ناو کتێب دەکات و ناوی وێنەکان دەزانێت | -دوو وشە بە کار دێنێت بۆ وصفی کردار<br>-ئاماژە بۆ خۆی دەکات بە ناوی خۆی | - باز دەدات<br>-شت هەڵدەدات و دەیگرێتەوە<br>-لاپەڕەکانی کتێب لاپەرە لاپەرە هەڵدەداتەوە<br>-پەنجەکانی بە کار دێنێت | - دەگرێت کاتێك دایکی بەجێیبهێڵێت<br>-بە ئاسانی هیلاك دەبێت<br>- ئاگاداری منداڵانی تر دەبێت | -بە تەنها دەرگا دەکاتەوە<br>-یەبێ هاوکاری جلەکانی دادەکەنێت<br>-بەرگ یان سەری شت دەکاتەوە |
| لە ٢٤-٣٦ مانگ | -دەتوانێ شێوەکان و بابەتەکان بخاتە سەر یەك<br>- لەزەت لە وێنەکانی ناو کتێب دەبینێت<br>-خۆی دەناسێتەوە لە ئاوێنەدا<br>-تا ژمارە ١٠ دەژمێرێت | -بەشداری دەکات لە سرودو گۆرانی<br>-هەندێ ڕستە بە کاردێنێت کەلە سێ وشە پێك هاتبێت<br>-لە یەك کاتدا دوو فەرمان جێبەجێ دەکات | -ڕادەکات و شەق لە تۆپ دەدات<br>-دەڕوات و باز دەدات<br>-هێڵی ڕاست و ڕێك دەکێشێت<br>-مورووەکان ڕێکدەخات | -واخۆی دەردەخات کە یاری دەکات<br>-خۆی لادەدات لە مارودۆخی مەترسیدار<br>-دەستپێشخەری یاری دەکات<br>-هەوڵدەدات پەسەند بێت بە ڕۆڵی خۆیەوە | -بە کەوچك نان دەخوات<br>-تواليت (W.C) بە کار دێنێت بە بێ هاوکاری |

( شبكة تحدي مرض التوحد بالعالم العربي http://www.autismarabia.com **وەرگیراوە** )

منداڵی ئۆتیزم تەنها لە یەك لایەنەوە دواناکەوێت، بەڵکو لە زۆر لایەنەوە دوادەکەوێت، وەك (زمان-پەیوەندی کۆمەڵایەتی-ڕەفتار- گرنگیدان بە خۆد- تادوای) ئەمەش گرفتێکی گەورەیە بۆ خێزان و پسپۆڕانی بواری ئۆتیزم.

کێشەیەکی گەورەی منداڵی ئۆتیزم ئەوەیە کە نایەکسانییەك هەیە لە گەشەکردنیدا، بۆ نموونە کە تەمەنی دەگاتە پێنج ساڵی، ئەگەر هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، ڕەنگە لە رووی زمانەوە لە تەمەنی نۆ مانگی یان زیاتر یان کەمتر بێت، بەڵام دەبینین لە رووی پەیوەندی کۆمەڵایەتیەوە ڕەنگە لە تەمەنی دوو ساڵی یان زیاتر-یان کەمتر بێت، بە هەمان شێوە بۆ هەموو تواناکانی تر، ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە بۆ خێزان و پسپۆڕان و ڕاهێنەران، چونکە دەبێت بەرنامەکان بە پێی گەشەی منداڵەکە بێت، واتا دەبێت لە رووی زمانەوە وەك منداڵێکی تەمەن (٩) مانگ مامەڵەی لە گەڵدا بکرێت و بەرنامەی بۆ دابنرێت، بەڵام لە رووی پەیوەندی کۆمەڵایەتیەوە دەبێت وەك منداڵێکی (٢) ساڵی مامەڵەی لە گەڵدا بکرێت و بەرنامەی بۆ دابنرێت، بە هەمان شێوە بۆ تواناکانی تر، بەڵام دەبینین منداڵێکی بیرکۆڵ بۆ نموونە کە دواکەوتنی هەیە هەیە لە گەشەدا، لە هەموو لایەنەکان لە یەك ئاستدایە، بۆ نموونە ئەگەر هاتوو منداڵێکی

بیرکۆڵ تەمەنی (٧) ساڵ بوو، ڕەنگە لە ڕووی زمان و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و توانای ڕۆژانەوە لە یەك ئاست بێت و لە منداڵێکی تەمەن (٣) ساڵ بچێت.

لەم خشتەیەدا خێزان دەتوانێت تێبینی منداڵەکەی بکات و بزانێت لە هەموو لایەنەکانەوە منداڵەکەی لە چ ئاستێکدایە، بەمەش دەتوانێت سوود لە بەرنامەکان ببینێت و بەرنامەی بۆ دابنێت بە پێی تەمەنی گەشەکەی.

# جۆرەکانی تێکچوونی گەشەی گشتی (PDD)
# Pervasive Developmental Disorders

لێرەدا هەندێك جۆر دەخەینە روو که به تێکچوونی گەشەی گشتی ناو دەبرێت، هەندێك پسپۆر پێیان وایه ئەمە جۆرەکانی ئۆتیزمه، بەلاَم له راستیدا ئەمه جۆرەکانی تێکچوونی گەشەی گشتییه کـه ئـۆتیزمیش جۆرێکـه لـەم جۆرانـه، جۆرەکـانی تێکچوونی گەشەی گشتی (اضطرابات النمو الشامل) بریتین له:

١- تەنگەژەی رت – اضطراب الرت (Rett)
٢- ئەسپێرجەر – الاسبرجر (Asperger)
٣- تەنگـەژەی ئـۆتیزم – اضـطراب التوحـد (Autistic Disorder)
٤- تەنگەژەی پاشەکشەی گەشەی منداڵی- اضطراب الطفولي الانحلالـي (Childhood Disintegrative Disorder)
٥- تەنگـەژەی گەشـەی گـشتی دیـاری نـەکراو- اضـطراب النمائیـة الـشاملة غیـر محـددة (Atypical

(Developmental Disorder Pervasive
(الاحمد ، ٢٠٠٥ ، لا ٢٤).

١ـ تەنگەژەی ڕت ( ئەم حاڵەتە تەنها تووشی كچان دەبێت، لەم حاڵەتەدا منداڵ لەتەمەنی (٦-١٨) مانگی بەئاسایی گەشەدەكات، دواتر دایكو باوك تێبینی گۆڕانكاریی لەڕەفتاری منداڵەكەدا دەكەن لەگەڵ گەڕانەوەی بەرەو دواوە، یان تەنها لەهەندێ توانای وەرگیراو بەتایبەت بەهرەی جووڵەی گەورەو ڕۆشتن، ئەمەش هاوكاتە لەگەڵ كەمی توانای قسەو بیركردنەوەو بەكارهێنانی دەستەكان، هەروەها منداڵ هەندێ جووڵەو ئاماژەی بێ دووبارە دەكاتەوە، ئەمەش بە كلیلی دەستنیشان كردن دادەنرێت) (الاحمد، ٢٠٠٥، لا ٦٦).

٢ـ ئەسپەرگەر سیندرۆم (syndrom Aspergaer) جۆری ئەسپیرجەر یەكێكە لەتەنگەژە یان تێكچوونە پێشكەوتنەكان (اضطرابات التطورية)، تۆزێك درەنگتر نیشانەكانی دەردەكەوێت، نیشانەكانی لەم بوارانە بەدی دەكرێت (كەمی توانا كۆمەڵایەتییەكانو قورسی لەمامەڵەی كۆمەڵایەتیو كەمی هۆشداری (التركيز)، گرنگی دانیان بەهەندێ شتی تایبەت

دەبێت و توانایەکی زیرەکی سروشتیان هەیە) (الاحمد، ٢٠٠٥ ، لا ٦٧).

٣-تەنگەژەی ئۆتیزم-التوحد: لەم حاڵەتەدا منداڵ کێشەی لە پەیوەندی زمان و دروست کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە گەڵ هاوتەمەنیدا هەیە, هەر وەها کێشەی ڕەفتاری یەك ڕێچکە و دووبارە هەیە, لە هەمان کاتدا ناتوانێت خەیاڵی هەبێت لە یاری کردندا.(النجار/ ٢٠٠٦/لاپەڕە ١٤ )

٤- تەنگەژەی منداڵی گەڕاوە (اضطراب الطفول التراجعی) (Disorder Disintegrateve Childhood)، ئەم حاڵەتە زۆر بەکەمی ڕوودەدات، پێش دە ساڵی تەمەن دەردەکەوێت، منداڵ لەم جۆرە لەزۆر لەتواناو ئەرکەکاندا دەگەڕێتەوە وەك جووڵەو توانای چوونە سەر ئاو و پەیوەندیی زارەکیو کۆمەڵایەتی. (سلیمان، ٢٠٠٧، لا ٣٨ و ٣٩).

٥- تەنگەژەی گەشەی گشتی دیاری نەکراو(Disorder Pervasive) (ئەگەر هاتو نیشانەکانی دوای ئەوە هات، کە منداڵ لەدوو ساڵی یەکەم بەئاسایی گەشەی کردو بەرەو پێش ڕۆیشت، نیشانەکانی پێش ١٠ ساڵی تەمەن دەردەکەوێت،

بەتایبەت کاتێك تێبینی دەکرێت لەزۆر ئەرك دا بەرەو دواوە دەڕوات وەك توانای جوولەو خۆ تەرکردنو توانا زمانەوانیو کۆمەڵایەتییەکان (الاحمد، ٢٠٠٥، لا ٦٩)

**بەلام پسپۆرو زانایان ئۆتیزم پۆلێن دەکەن بە سەر چوار کۆمەڵەی جیاوازدا, ئەو کۆمەڵانەش بریتیە لە:**

**١-کۆمەڵەی پۆلێن نەکراو** (المجموعة الشاذة - Atypical Group)

**٢-کۆمەڵەی خودتەنهایی سادە** (المجموعة التوحدية البسيطة- Moderately Autistic Group)

**٣-کۆمەڵەی خودتەنهایی مامناوەندی** (المجموعة التوحدية المتوسطية- Moderately Autistic Group)

**٤-کۆمەڵەی خودتەنهایی توند** (المجموعة التوحدية الشديدة- Severely Autistic Group), (المغلوث,٢٠٠٦, ص٤٨-٤٩).

سەبارەت بە شیوەکانی ئۆتیزم لە نێوان توند و مام ناوەند و سادە دا بە پێی کۆ کردنەوەی خاڵەکان دەبێت لە خشتەی دەستنیشان کردنی ئۆتیزمدا ( DSM٤) کە دەبێت لە کۆی (١٢) نیشانە بەلایەنی کەمەوە (٦) نیشانەی تێدا بێت, لە سەرەوە بە وردی باسمان لەو دەستنیشان کردنە کردوە.

# هۆکاری ئۆتیزم

هـەموو نەخۆشـییەك یـان حاڵـەتێکی دەروونـی یـان کۆمەڵایەتی بێ هۆکار نییـە، بێگومـان ئـۆتیزمیش وەك هـەموو ئەو حاڵەتانە کۆمەڵێك هۆکـارو فاکتـەری هەیـە، کـە کـار دەکاتـە سەری، بەڵام بەهۆی تـازەی و ئـاڵۆزی حاڵـەتی ئـۆتیزم بەبـەراود بەحاڵەتو نەخۆشییەکانی تر تـا ئێستا بەتـەواوەتی هۆکارەکـان نـەزانراون، هەرچـەندە زانایـان هەنـدێ هۆکاریـان دانـاوەو لێکۆڵینەوەش بەردەوامە، بەتایبەت لەئەمریکاو ئەوروپادا.

هەنـدێك لـەو هۆکارانـەی کـە تائێـستا زیـاتر ئامـاژەی بـۆ دەکرێـت، وەك هۆکـار بـۆ حاڵـەتی (ئـۆتیزم ـ خـود تـەنیایی) بریتین لەم هۆکارانە:-

١. هۆکـاری بۆمـاوەیی: مەبەسـت لـەبۆماوەیی ئەوەیـە، کـە لەخێزانـدا کەسـێك یـان زیـاتر لەکەسـێکیان هـەلگری جـۆرە جینـاتێکن کـە کـەموکورتی تێدایـەو لـەکاتی گواسـتنەوەی بـۆ نەوەکانی تر ئەگەری تووشبوون بۆ نەوەکانی تر زیاددەکات.

٢. تووشبوونی منداڵ بەهەنـدێ فـایرۆس لـەکاتی بوونیـدا لەسکی دایك، ئەم فایرۆسە تووشـی دایـك دەبێـت وەك سیرۆژەی ئەڵمانی (الحصبة الالمانية).

٣. بەکارهێنانی دایک بۆ هەندێ داو دەرمان لەکاتی دووگیانیدا، وەك دەرمانی پەرکەم (الصرع).

٤. کەمی لەڕێژەی ڤیتامینات، بەتایبەت (ترشی فۆلیك و ڤیتامینی بی و ڤیتامینی أ ، هـ ، ج) و ئاسن گرنگترینیان (زنك و ماغنسیوم و سیلینیۆم). (مصطفی، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٣٣ تا ٣٥).

بەڵام زانایان ژینگەیان وەك هۆکارێك پشتگوێ نەخستوە، کە کار دەکاتە سەر ئۆتیزم ـ خود تەنیایی و زیاتر ئاڵۆزی دەکات، لەهەمان کاتدا کەمی شارەزای دایك و باوك هۆکارێکی ژینگەیی ترە، کە کار دەکاتە سەر ئاڵۆزی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی (محمد، بێ ساڵی چاپ، لاپەڕە ٢٥ و ٢٦).

زۆر لێکۆڵەر وەك گریمانە هۆکارییان بۆ ئۆتیزم داناوە، چونکە تائێستا هیچ لێکۆڵنەوەیەك نەیتوانیوە، لە ٪ ١٠٠ ئەو هۆکارانە دەستنیشان بکات، بۆیە ئەو هۆکارانە دەخەینە ڕوو:

١. هۆکاری بۆماوەیی: (بوونی ئاڵۆزی و تێکچوونێك لەفەرمانەکانی دەزگای ناوەندی دەمار) (نوری و دزەیی، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٧)، زۆر لەو لێکۆڵینەوانەش تا ئێستا نەگەشتونەتە هیچ بەڵگەیەك، کە ڕۆڵی دایك و باوك دەربخات لەکاریگەرییان لەبوونی منداڵی ئۆتیزم. (الاحمد، ٢٠٠٥، لاپەڕە ١٥).

٢. زەبرو فشار لەکاتی لەدایکبوون بەتایبەتی لای چەپی مێشك.

٣. تووشبوونی دایك بەنەخۆشی سورێژە لەکاتی دوو گیانیدا.

٤. نەبوون یان کەمی ئۆکسجین لەکاتی لەدایکبووندا، واتا منداڵ لەکاتی لەدایکبوون ئۆکسجینی تەواوی بۆ نەڕۆشتبێت. (نوری و دزەیی، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٧ - ٩).

لێکۆڵینەوەکان تا ئێستا بەردەوامیان هەیەو بەدوای هۆکارو چارەسەری حاڵەتی ئۆتیزمدا دەگەڕێن، ئەمەش بە هۆی زیادبوونی ڕێژەی ئۆتیزم لە هەموو دونیا, ئەوەی تائێستا بوون هەیە زیاتر وەك گریمانە دانراوە, چونکە توێژینەوەیەك نیە لە ئێستادا توانیبێتی لە سەدا سەد هۆکاری ئۆتیزمی دۆزیبێتەوە, هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە نەتوانراوە چارەسەری گونجاو بۆ ئۆتیزم بدۆزرێتەوە.

# مێژووی ئۆتیزم

ئۆتیزم ـ خود تەنیایی وەك هەموو حاڵەتێك مێژوویەكی هەیە، ئەم زاراوەیە بۆ یەكەم جار لەلایەن (لیۆكانر)ەوە بەكارهات (حسن، ٢٠١٢، لاپەڕە ٢٤٠). لەساڵی ١٩٤٣ واتا لەچلەكانی سەدەی ڕابردوو (لیۆكانر) یەكەم كەس بوو، كە وشەی ئۆتیزمی بەكارهێناو لیستێكی دانا بۆ ئەو نیشانانەی كە منداڵی ئۆتیزمی پێ جیادەكرێتەوە، بەڵام لەساڵی ١٩٤٤ (هانز اسبیرجر) جۆری ئەسپیرجری بۆ جۆرەكانی ئۆتیزم زیادكرد (ارونز و جیتنس، بێ ساڵی چاپ، لا ١٠)، زانایان لەسەر لێكۆڵینەوە لەحاڵەتی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی بەردەوامبوون، لەساڵی ١٩٨٠ ( DSM III) بڵاوكرایەوەن وەك پێوەرێك كە جیاوازی كرد لەنێوان شیزۆفرنیا (كەرتە ژیری)و ئۆتیزم ـ خود تەنیایی (الجلبی، ٢٠٠٤، لا ١٢)، لەساڵی ١٩٩٤ ( DSM IV ) وەك پێوەرێك بۆ دەستنیشانكردنی ئۆتیزم دانرا، لەكاتێكدا لەساڵی ١٩٩٢ ( ICD ١٠) وەك پێوەرێك كاری پێ دەكرا، ئەم دوو پێوەرەش بەڕێكی تازە دەكرێتەوە (ارونز- جیتنس، بێ ساڵی چاپ ، لا ٣٣).

ئۆتیزم ـ خود تەنیایی تایبەت نییە بەكۆمەڵگەیەكەوە، تووشی دەوڵەمەندو هەژار دەبێت، تووشی ڕەش پێستو سپی

پێست دەبێت، تووشی دانیشتووی شارو لادێ دەبێت، تووشی منداڵی موسوڵمان و منداڵی مسیحی و منداڵی یەهودی دەبێت، ئەمەش وای کردوە، کە لەهەموو دونیا بەڕێژەیەکی بەرچاو زیادبکاتو هەموو ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای بگرێتەوە.

# ڕێژەی تووشبووان

ئـــۆتیزم ــــ خـــود تـــەنیایی وەك هـــەموو حاڵـــەتو نەخۆشییەکانی تر لەزیادبووندایە، لەهەندێ حاڵەتو نەخۆشی زیاتر بڵاودەبێتەوە، ئەمەش بوومتە هۆی سەرسوڕمانی زانایانی ئەم بوارە، بەتایبەت کە تا ئێستا هۆکارەکان لە ٪ ١٠٠ نەزانراوە .

ســـەنتەری پزیـــشکی لەشـــاری دیترۆیتـــی ئـــەمریکی لەبڵاوکراوەیەکیدا ئەوەی ڕاگەیاندوە، کە ڕێژەی ئۆتیزم ـ خود تەنیایی لەڕێـژەی (داون) زیـاترە لـەڕووی بڵاوبوونـەوە. (محمـد، بێ ساڵی چاپ، لا ٢٨).

هـەروەها کۆمەڵـەی ئـەمریکی بـۆ ئـۆتیزم (١٩٩٩) ڕێـژەی بڵاوبوونـەوەی ئۆتیزم لەئەمریکا بـە ٠٦،٠ ٪ دەستنیـشانکردوە، لەیابان لەنێوان ١٣،٠ ٪ بۆ ١٦،٠٪ دایـە (محمـد، بێ سـاڵی چـاپ، لا ٣١)، بـەڵام ئامارەکـان بـەردەوام لەگۆڕانکاریدایـە، بـۆ نموونـە هەنـدێ جار بۆ ١٠٠٠٠ کـەس ٧٥ حاڵـەت دادەنرێت، کـە گومـانی تووشبوونی بـەئۆتیزم لێ بکرێت، کوڕان لەکچان زیـاتر تـووش دەبـن، بـۆ نموونـە تـا کـچێك تووشـی ئـۆتیزم بێـت، ئـەوە لەبەرامبـەردا چوار کوڕ تـووش دەبێت، هـەروەها ئامـاژە بـەوە دەکرێت، لەئێستادا لـە ٨٨ منـداڵ یـەك منـداڵ تووشی ئۆتیزم ـ

خود تەنیایی ببێت لەئەمریکا (سایتی فەرمی، د. رابیـه الحکیم http://www.childguidanceclinic.com ).

وەك باسمان کرد، لەئێستا ئۆتیزم ـ خود تەنیایی یەکێکە لە حاڵەتە باوەکانو ڕێژەی بڵاوبوونەوەی ڕۆژ بەڕۆژ لەزیادبوونـه، بۆیە ئەو ئامارانەی ئەمرۆ دەخرێنە ڕوو، جیاوازە لەو ئامارانەی هەفتەیـەکی تـر دەخرێنــه ڕوو، چـونکه ئـەو ئامــاره نوێیانــه بـەردەوام گۆڕانکـاری بـه سـەردێت، ئەمـەش بـه هـۆی نادیـاری ئامارەکـان، بۆیــه هـەر ڕێکخراوێـك یـان دەزگایـەك ژمارەیـەك دادەنێت بۆ چەند سەدێك یان چەند هەرزارێك، بـەڵام لـه ڕووی زیاتر تووشبوونی کوڕان لـه کچان هـەموو ئامارەکان وەك یـەك ئاماژە بەوە دەکەن کـه کوڕان زیـاتر تووشـی ئـۆتیزم دەبـن، بـێ ئـەوەی توانیبێتیـان ئـەو هۆکارانـه بخەنـه ڕوو کـه کـوڕان زیـاتر تـووش دەبێـت، لەئێـستاشدا زیـاتر لـه ٧٠٠ حاڵـەتی ئـۆتیزم لەکوردستاندا هەیەو چەندین منـداڵی تـر هەیـه کـه چاوەڕوانە لیژنەی پزیشکی بیبینێتو دەستنیشانی بکات، بەوەی ئۆتیزمـه یان ئۆتیزم نییە، کۆمەڵەیکی تایبەت هەیە بـەخێزانی منـداڵانی ئۆتیزم بەناوی (کۆمەڵەی ئۆتیزمی کوردستان).

# چارەسەری ئۆتیزم

تا ئێستا زانایان نەگەیشتونەتە چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئۆتیزم، کە بۆ هەموو منداڵان وەك یەك بگونجێت، هەموو ئەو چارەسەرانەش باسی لێوەدەکرێت، تا ئێستا نەبووەتە چارەسەری ١٠٠ ٪ ، بەڵام تەنها چارەسەر کە بۆ هەموو منداڵانی ئۆتیزم وەك یەك بگونجێت، ڕاهێنان‌و مەشق پێکردنی منداڵانی ئۆتیزمە بەپرۆگرام‌و بەرنامەی تایبەت (نوری‌و دزەیی، ٢٠٠٨، لا ١٠). هەندێ جار ئەو بەرنامانە بەدەستێوەردانی پێشوەخت ناودەبرێت، ئەمەش لەتەمەنێکی زۆر منداڵی منداڵدا دەست پێدەکات بەگرتنەبەری چەند بەرنامەیەکی جیهانی، کە لەزۆربەی وڵاتاندا بەکاردێت، وەك بەرنامەی (تیتش) کورتکراوەی Treatement and Education of Autistic and Related Communication Handicapped Children (TEACCH)

ئەم بەرنامەیە بەمانای چارەسەرو فێرکردنی منداڵانی تووشبوو بەئۆتیزم‌و منداڵانی هاوشێوەی منداڵانی ئۆتیزم لەڕووی پەیوەندییەوە دێت، ئەم بەرنامەیە بۆ تەمەن (٣ تا ١٨ ساڵ ) دەبێت، تەنها لایەنی زمان‌و ڕەفتار ناگرێتەوە، بەڵکو بەرنامەیەکی گونجاوە بۆ تاکە کەس، کە بەپێی پێداویستی

منداڵ دانراوە (سلیمان، ٢٠٠٧، لا ٧٧ و ٧٨). مەرج نییە، هەموو ڕێگەو شێوەکانی چارەسەرکردن بۆ هەموو منداڵانی ئۆتیزم وەك یەك بگونجێت، بۆیە شێوازی بەرنامەکان لەلایەن خێزان‌و پسپۆڕانەوە جۆراوجۆرە، بەڵام ڕەنگە هەموویان یەك ئامانجیان هەبێت، بەشێوەیەکی گشتی شێوازەکان ئەم بوارانە دەگرێتەوە (گۆڕینی ڕەفتار، ڕێگەی دروستکردنی زانستی، دەرمان، چارەسەری گوتن، چارەسەری پیشەیی و .... هتد) (الاحمد: عبد الجليل/ سەرچاوەی پێشوو/ لا ١٠٩).

هەروەها بەرنامەی (پێکس) واتا سیستەمی ئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندی بەوێنە، بەرنامەیەکی گرنگە، کە لەگەڵ منداڵی ئۆتیزم بەکاردێت، بەکارهێنانی وێنە لەگەڵ منداڵی ئۆتیزم، زۆر توانای فێر دەکات لەژیانی ڕۆژانەیدا. (محمد، بێ ساڵی چاپ، لا ٩).

چارەسەی پرۆتۆکۆڵ دان یەکێکە لەچارەسەرە باوەکانی حاڵەتی ئۆتیزم، بەڵام ئەم چارەسەرەش نەبووەتە چارەسەرێکی گشتی بۆ منداڵانی ئۆتیزم، چارەسەرکردن بەپێی پرۆتۆکۆڵ دان ئەم شتانە دەگرێتەوە:

- بەدواداچوونی سیستەمێکی خواردنێکی دیاری کراو، لەگەڵ خواردنی تەواوکارییەکان.

- چارەسەرکردنی ڕیخۆڵەکان لەبەکتریا.
- پاککردنەوەی لەش لەکانزا قورسەکان.
- دوورکەوتنــەوە لــەو خواردنانــەی کــە دەبنــە هــۆی

هەستیاری لای منداڵ. (مصطفى، ٢٠٠٨، لا ٧٢).

- ژووری ئۆکسجینی پەستێنراو.

بەشـێوەیەکی گـشتی چارەســەر زیــاتر لایــەنی ڕاهێنــان دەگرێتەوە لەسەنتەرێکی پسپۆڕو تایبەت بەمنـداڵی ئـۆتیزم، بـۆ ڕێککردنــەوەی ڕەفتــارو ڕاهێنــانی منــداڵ لەســەر ماســولکەی بچووک و ماسولکەی گەورەو هۆشداری و پەیوەنـدی دەس و چاوو ڕاهێنــان لەســەر قــسەکردن و لایــەنی هەســتیاری، بەشـێوەیەکی گـشتی دەتــوانین بڵـێین، ڕاهێنــانی منــداڵ لەســەر هــەر پێــنج هەسـتەکەو تواناکـانی ڕۆژانــە، کــە منـداڵی ئـۆتیزم کێـشەی لـەو لایەنانــە هەیــە، لــە گــەڵ گەشــەپێدانی لایــەنی کۆمەڵایــەتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان.

بێگومــان لــە گــەڵ زیــادبوونی ڕێــژەی ئـۆتیزم لــە هــەموو جیهاندا، وایکرد زانایان و پسپۆڕان لە هەوڵدا بن بۆ دۆزینـەوەی بەرنامـەی گونجـاو بـۆ ڕاهێنــانی منـداڵانی ئـۆتیزم، ئەمــەش وای کـرد چـەندین بەرنامـە دابنرێـت و بـە کـار بێـت بـۆ ڕاهێنــانی منداڵانی ئۆتیزم، بەڵام مەرج نیە سەرجەم ئـەو بەرنامانـە وەك یەك سەرکەوتوو بووبێتن لە ڕاهێنانی منداڵانی ئۆتیـزم، هەنـدێ

لەو بەرنامانە دەخەینە ڕوو کە ئێستا بوونەتە بەنامەی جێهانی و لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا بە کاردێت, ئەو بەرنامە جیهانیانەی بۆ ڕاهێنانی منداڵی ئۆتیزم بە کاردێت بریتیە لەم بەرنامانەی لە خوارەوە هاتووە:

**١-بەرنامەی ( لۆڤاز )ی ڕەفتاری – هەڵسوکەوت ( Applied Behavior Analysis ) شیکاری ڕەفتاری جێبەجێکار:-**

بەرنامەی لۆڤاز, یان بە بەرنامەی شیکاری ڕەفتاری جێبەجێکار ناو دەبرێت (ABA), ئەم بەرنامەیە ساڵی (١٩٧٨) لە لایەن کەسێکەوە دانراوە بە ناوی ( لۆڤاز) کە مامۆستای پزیشکی دەرونی بوو لە زانکۆی ( لوس انجلوس) بەرنامەکەش بە ناوی خۆیەوە ناو ناوە.

لەم بەرنامەیەدا توانا قورس و ئاڵۆزەکان دابەش دەکرێن بۆ هەندێ توانای سوك و ئاسان کە منداڵی ئۆتیزم لە توانایدا هەبێت جێبەجێی بکات, بۆیە هەڵسەنگاندێك بۆ تواناکانی منداڵی ئۆتیزم دەکرێت بۆ ئەوەی بتوانرێت ئەو توانانە دیاری بکرێت کە پێویستە بۆ باش کردنی ڕەفتارو تواناکانی, دواتر بەرنامەیەکی دەستێوەردا (تدخل) ڕێکخراو دادەنرێت بۆ ئەوەی منداڵەکە لە تواناییدا هەبێت بە بێ هاوکاری و پشت بەستن بە

کەس خۆی چالاکییەکان ئەنجام بدات, لێرەدا هەوڵ دەدرێت ڕەفتاری لاسایی کردنەوە (تقلید) لای منداڵی ئۆتیزم گەشە بکات, ئەمەش بە شێوەی مەرج دەکرێت, واتا دەبێت منداڵی ئۆتیزم لە بەرامبەر ڕەفتاری باش پاداشت بکرێت, ئەمەش دەبێتە هۆی بەرەو پێشچوون و لاسایی کردنەوە و دووبارە کردنەوەی ئەو ڕەفتارە, بە هەمان شێوە گرنگی بە لایەنی خستنە سەر یەك و توانای کۆمەڵایەتی و پەیوەندی دەدرێت لای منداڵی ئۆتیزم, دەبێت بەلایەنی کەم هەفتانە نزیکەی (٤٠) کاتژمێر بە پێی ئەم بەرنامەیە ئیش لە گەڵ منداڵی ئۆتیزمدا بکرێت, بۆیە ئەم بەرنامەیە لە رووی تێچوونەوە بە بەرنامەیەکی قورس دادەنرێت بۆ خێزان, بەڵام لە رووی سەرکەوتنەوە لە زۆربەی وڵاتان بە کار دێت و یەکێکە لەو بەرنامانەی کە سەرکەوتوو بووە ( سایتی فەرمی اطفال الخلیج ذوي احتياجات الخاصة – www.gulfkids.com) , بە بۆچوونی ئەم بەرنامەیە دەتوانرێت کۆنترۆڵی ڕەفتاری منداڵی ئۆتیزم بکرێت لە ڕێگەی زانینی ژینگەوە, هەر وەها کۆنترۆڵ کردنی ئەو فاکتەرو هۆکارانەی دەبنە هۆی ڕەفتارەکە, چونکە هەموو ڕەفتارێك پاڵنەرو هۆکاری خۆی هەیە.
( المغلوث/٢٠٠٦/لاپەڕە ١٣٢ )

ئەم بەرنامەیە تەنها بۆ منداڵانی ئۆتیزم نیە، بەڵکو بۆ ئەو منداڵانەش دەگونجێت کە کێشەی ڕەفتاریان هەیە، بە هەمان شێوە بۆ ئەو منداڵانەی جوڵەی زۆر و کەمی هۆشداریان هەیە(فرط الحركة وتشتت الانتباه).

ڕەفتاری باش دەبێت پاداشت بکرێت و ڕەفتاری هەڵەو نابەجێش دەبێت سزا بدرێت، ئەمەش دەبێت هۆی زیاد بوونی ڕەفتارە باشەکەو بەرەو پێشچوونی.

کەی دەبێت پاداشتی ڕەفتاری باش بکەین؟ دەبێت پاداشتەکە چۆن بێت؟ ئەمە و چەندین پرسیار هەیە کە دەبێت خێزان و پسپۆران و ڕاهێنەران بیزانن بۆ ئەوەی پاداشتەکە سوودی هەبێت و بەراستی ببێتە هۆی بەرەو پێشوونی منداڵەکە.

١- دەبێت پاداشت ئامادە بێت و یەکسەر دوای ڕەفتارە باشەکە بدرێت بە منداڵەکە، واتا نابێت دوابخرێت بۆ کاتێکی نادیار.

٢- دەبێت پاداشتەکە بەرێژەیەکی کەم بێت نەك منداڵەکە زوو تێر ببێت لە پاداشتەکە و ئیتر واز لە ڕەفتارە باشەکە بێنێت، دەبێت ئەو پاداشتە بەرامبەر بێت بەو ڕەفتارە باشە.

٣- دەبێت دوای هەموو وڵامدانەوەیەك یان ڕەفتارێك منداڵەكە پاداشت بكرێت، دوای ماوەیەك دەكرێت منداڵەكە لە بەرامبەر چەند وڵامدانەوەیەك یان چەند ڕەفتارێك پاداشت بكرێت.

٤- دەبێت بزانین چ جۆرە پاداشتێك دەدەین بە منداڵەكە، واتا دەبێت ئەو پاداشتە گرنگی هەبێت لای منداڵەكە، ئەگینا وڵامدانەوەی نابێت، لە هەمان كاتدا واباشە تەنها یەك جۆر پاداشت نەبێت، بەڵكو جۆراو جۆر بێت.

٥- باشتر وایە لە گەڵ پاداشتی ماددی پاداشتی مەعنوی-كۆمەڵایەتی هەبێت، وەك (هاندان- ماچ كردن- لە ئامێزگرتن- تادوای) بەڵام دەبێت لەم حاڵەتدا لایەنە هەستیارییەكانی منداڵ بە هەند وەربگیرێت.

٦- ناكرێت ئەو پاداشتە بكرێت بە بەرتیل (ڕەشوە)، واتا بۆ بێدەنگ كردنی منداڵەكە لە گریان یان توڕبوون پاداشت بكرێت.

٧- تا چالاكییەكە یان ڕەفتارەكە یان ئەو داواكارییەی كە داوا كراوە جێبەجێی نەكات ناكرێت پاداشت بكرێت.

٨- واباشترە منداڵەکە لە هەندێ حاڵەتدا خۆی ئازاد بکرێت کە پاداشتەکە هەڵببژێرێت.

٩- باشترە هەندێ جار پاداشتەکە نەزانرو بێت و لە پڕێکدا بۆ منداڵەکە ئاشکرا بکرێت, بە تایبەت ئەگەر ئەو پاداشتە لای منداڵەکە مانا و بایەخێکی تایبەتی هەبوو.

١٠- دەبێت ئەو ڕەفتارە ناو بنرێت کە پاداشت دەکرێت, ئەمەش ئاسان کاری دەکات بۆ منداڵەکە کە بزانێت ئەو ڕەفتارە چیە کە پاداشت دەکرێت. (.سایتی فەرمی – شکبة تحدي مرض التوحد في العالم العربي- http://www.autismarabia.com )

بێگومان بۆ پێچەوانەی هەموو ئەو ڕەفتارانەش دەکرێت منداڵ سزا بدرێت, سزاش جۆری زۆرە, گرنگترین ئەو سزانانەش ڕاگرتنی پاداشت و قەدەغە کردنی ئەو یاری و خواردنانەیە کە وەك پاداشت بە کار دێت و لای منداڵەکە گرنگە.

لە کاتی ئەنجامدانی چالاکیدا, بۆنموونە کاتێك منداڵەکە لە سەر کورسی دانیشتووە بۆ ئەنجامدانی چالاکی کە ئەنجامدا پاداشت وەردەگرێت, ئەگەر هاتوو ویستی جێگاکەی بە جێبهێڵێت ناکرێت بە دەنگێکی بەرز ئاگادار بکرێتەوە و

بترسێت، بەڵکو ڕێگە چارەی تر هەیە کە دەبێت بدۆزرێتەوە بۆ بەرکارهێنانی لە گەڵ منداڵەکە، ڕەنگە منداڵی ئۆتیزم نەتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان کاتی یاری و کاتی ئەنجامدانی چالاکییەك یان فەرمانێك، بۆیە دەبێت فێر بکرێت چۆن فەرمانەکان جێبەجێ دەکات و گوێڕایەڵ دەبێت، دەبێت پاداشتەکە مەرجدار بێت، بۆنموونە دەبێت منداڵەکە بۆ ماوەی (٢٠) خولەك دابنشێت پاشان پاداشت دەکرێت، بەڵام ڕەنگە ئەمە بۆ منداڵانی بچووك قورس بێت، بۆیە دەبێت هەنگاو هەنگاو ئەم کارە ئەنجام بدرێت. ( زمام/٢٠٠٨/لاپەڕە ٧٠-٧٢)

## ٢-تیتش

## Treatement and Education of Autistic and Related Communication Handicapped Children (TEACCH)

چارەسەرو پەروەردەکردنی منداڵانی ئۆتیزم و کێشەکانی پەیوەندی لە یەك چوو: ئەم بەرنامەیە لە ساڵی ١٩٧٢ لە لایەن دکتۆر ( ئەریك شوبلر) دانراوە، یەکەم بەرنامەی پەروەردەی تایبەتە بە منداڵانی ئۆتیزم، دواتر لە لایەن ( کۆمەڵەی ئۆتیزمی ئەمریکیەوە) وەك یەکەم بەرنامە پشتی پێ بەسترا، ئەم بەرنامەیە بۆ هەموو تەمەنەکانی ئۆتیزم دەگونجێت، واتا لە

( ٨ مانگیەوە تا ٥٥ ساڵی ) بە مەرجێك دەستنیشان کرابێت، بە ئۆتیزم یان بە هەر جۆرێکی تری تێکچوونی گەشەی گشتی، (الشامی/٢٠٠٤/لاپەرە ٣٣و٣٤ )

ئەم بەرنامەیە ( تیتش )بریتیە لە فێرکردنی ڕێکخراو، ئەمە پرۆسەیەکی تەواو کارییە بۆ دەستێوەردانی چارەسەری بۆ منداڵانی خاوەن پێداویستی تایبەت، ئەم بەرنامەیە گرنگی دەدات یە ژینەکەی دەوروبەری منداڵ کە ژینگەیەکی ڕێکخراو و روون و زانراو بێت، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەم ژینگە ڕێکخراوەدا منداڵ دەتوانێت پێشبینی بکات بۆ داهاتوو چی رودەدات، کەمتر دادەمێنێت، ئەمەش کێشەکانی ڕەفتار کەم دەکاتەوە و زیاتر هەست بە سەر بە خۆی و بڕوابوون و پشت بە خۆ بەست دەکات ( زمام/٢٠٠٨/لاپەڕە ٦٧ )

ئەم بەرنامەیە بۆ منداڵانی ئۆتیزم و ئەو منداڵانە بە کار دێت کە کێشەی زمان و پەیوەندی یان توانای کۆمەڵایەتیان هەیە، بە پێی ئەم بەرنامەیە بە وێنە ژینگەیەکی ڕێکخراو بۆ منداڵی ئۆتیزم ڕێکدەخرێت، چونکە منداڵی ئۆتیزم حەزی بە رۆتینە، لە هەمان کاتدا توانای چاوی بەهێزە، بە پێی توانا کانی بەرنامەی بۆ ڕێکدەخرێت، وێنەی بۆ دادەنرێت لەو جێگانەی کاتەکانی تێیدا بە سەر دەبات، ئەمەش بە مەبەستی ڕێنمای

بوونی بە شێوەیەکی گونجاو، ئەو وێنانەی بە کار دێت دەکرێت وێنەی فۆتگرافی بێت، یان وێنەی دروستکراو بێت، ئەمەش بە پێی تواناو زیرەکی منداڵی ئۆتیزم دەگۆڕێت، بۆ نموونە وێنەی (W.C)، وێنەی مێزو کورسی، کە ئاماژەیە بۆ دانیشتن و چالاکی، بەم شێوەیە هەموو خشتەی ڕۆژی بۆ دەکرێت بە وێنە (سایتی فەرمی دکتۆرە رابیە الحکیم www.childguidanceclinic.com ).

ئەم بەنامەیە تەنها لە ماڵ بە کار نایەت، بە پێچەوانەوە دەبێت لە هەموو ئەو جێگانە بە کار بێت کە منداڵی ئۆتیزمی تێدایە، وەك سەنتەری تایبەت بە منداڵی ئۆتیزم، بەلام لە هەموو حاڵەتێکدا خێزان ڕۆڵی تەواو دەبینێت لەم بەرنامەیەدا(الشامی/٢٠٠٤/لاپەرە ٣٣و٣٤)

بۆ چی ژینگەی ڕێکخراو بۆ منداڵی ئۆتیزم پێویستە؟

منداڵی ئۆتیزم لە ژینگەیەکی ئاساییدا کێشەی زۆری هەیە، ئەو کێشانەش وای لێدەکات بەردەوام هەست بە دڵەراوکێ و ترس بکات، ئەمەش وا دەکات بەردەوام ڕەفتاری دووبارەی هەبێت، ئەم بەرنامە ڕێکخراوە هەرچەندە ڕۆتینی بۆ دروست دەکات، بەلام ئارامی دەکاتەوە.

ئەو کەسانەی حاڵەتی ئۆتیزمیان هەیە لە ژینگەیەکی ئاساییدا ئەم کێشانەیان هەیە:-

- دڵەڕاوکێ و (توتر) لە ژینگەی فێرکردنی ئاسایی، ئەمەش ڕێگر دەبێت لە فێرکردنی.
- خووگرتن بە ڕۆتینەوە.
- ئاستەنگی هەیە لە تێگەیشتن لە دەستپێکردن و کۆتایی چالاکییەکان و زنجیرەی ڕوداوەکانی ڕۆژ بە شێوەیەکی گشتی.
- ئاستەنگی هەیە لە گواستنەوە لە چالاکیەکەوە بۆ چالاکیەکی تر، یان لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر.
- ئاستەنگ لە تێگەیشتن لە قسەکان.
- ئاستەنگ لە تێگەیشتن لە جێگاکان و ڕووپێوییەکان ( مساحات) لە ژینگەدا.
- فێرکردنی درك پێکردنی چاوی ( الادراك البصری) پێ باشترە لە بری قسەکردن.

بۆ زاڵ بوون بە سەر ئەم کێشانەدا بەرنامەی ژینگەی ڕێکخراو هاتەکایەوە، بۆ ئەم مەبەستە دەبێت لەم بەرنامەیە کار لە سەر پێنج لایەنی سەرەکی بکرێت لە ژێگەدا، ئەو پێنج لایەنەش ئەمانەی خوارەوەن:

- دروست کردنی ڕۆتینێکی سنوردار.
- ڕێکخستنی ڕووپێوییەکان( المساحات).

- خشتەی ڕۆژانە.
- ڕێکخستنی کار(چالاکی)
- فێرکردنی بینین ( چاو – بصری)

بەم شێوەیە ڕۆتینێکی بە ڕوداوەکانی ڕۆژ و هەفتە بۆ منداڵەکە دروست دەکەی. (الشامی/٢٠٠٤/لاپەرە ٣٨و ٣٩)

دەکرێت ئەو خشتەیە بە شیوەی پانی یان ستوونی دابنرێت، وینەی ڕوداوەکان ڕۆژ و چالاکییەکانی پێوە هەڵبواسرێ، واتا هەموو چالاکییەکانی ڕۆژ وەك هەستان لە خەو و نان خواردن و چوونە توالێت ( W.C)و یاری کردن و هتد، ئەمەنانە ئاسانکاری باش بۆ منداڵی ئۆتیزم دەکات، ئەو منداڵانەی توانای خوێندنیان هەیە دەکرێت بە نووسین ناوی ئەو چالاکییە یان ئەو شتەی کە وێنەکەی هەیە لە ژێری نووسرابێت، ئەمە هاوکاری باشی دەکات لە ناسینەوەی چالاکییەکاندا، لە هەمان کاتدا لەم ژینگە ڕێکخراوە بە وێنە منداڵی ئۆتیزم هێدی هێدی فێر دەبێت کەی دەست دەکات بە چالاکییەك و کەی کۆتایی دێت، چونکە ئەوان لە ژینگەیەکی ئاساییدا ئەو کێشەیان هەیە لە دەست پێکردنی چالاکی و کۆتایی هاتنی چالاکی، لەم بارەیەوە واتا لە سەر بەرنامەی ( تیتش ) دەتوانن لە (ئینتەرنێت) زیاتر بخوێننەوە.

## ٢-پێـــــکس: PECS
## (Picture Exchange Communication System)

سستەمی پەیوەندی لە ڕێگەی گۆڕینەوەی وێنە:-

ئـەم بەرنامەیـە بـۆ ئـەو منداڵانەیـە کـە لاوازییـان هەیـە لـە پەیوەندی زمانەوانی، ئەو منداڵانە ئۆتیزم بن یان کێشەی زمان و پەیوەنـــدی زمانیـــان هـــەبێت، لـــەم بەرنامەیـــەدا وێنـــە دەگوڕدرێتـــەوە بـــۆ دروســـت کردنـــی پەیوەنـــدی، منداڵەکـــە ڕادەهێنرێـت لـە سـەر ئـەوەی وێنـەی ئـەو شـتەی مەبەسـتێتی دەیدات بە دایکی یان هەر کەسێکی تر کە کاری لە گەڵدا دەکات، لـە بەرامبـەردا ئـەو کەسـەش ئـەو شـتەی دەداتـێ، بـۆ نموونـە منداڵەکە خواردنێك یان یارییـەکی دەوێت، دەبێت ڕاهێنرابێت کـە ئـەو وێنەیـە بـدات بـە کەسـی بەرامبـەر و ئـەویش لـە بەرامبـەردا نـاوی یارییەکـە یـان خواردنەکـە دێنێـت و دەیداتـە دەستی، لە کۆتاییدا و دوای ڕاهێنانێکی باش دەبێت منداڵ ڕستە دروست بکات، ئەگەر هاتوو نەیتوانی قسە بکات ئەوە دەبێت وینەی ڕستە هەبێت، بۆنموونە وێنەی ( من، یاری یان خواردن، ئەمەوێت) بـە وێنـەکان ڕسـتەی ( مـن نـاوم ئـەوێت، یـان مـن ئەمەوێت یاری بکەم) بـەم شێوەیە دەتوانێـت گوزارشـت بکـات و

رستە دروست بکات(سایتی فەرمی دکتۆرە رابیە الحکیم (www.childguidanceclinic.com

ئەم بەرنامەیە لە ساڵی (١٩٩٤) دانراوە, لەم سستەمەدا منداڵانی ئۆتیزم فێر دەبن پەیوەندی لە گەڵ کەسەکاندا دروست بکەن لە ڕێگەی وێنەوە, ئەوەش بۆ بە دەستهێنانی پێداویستیەکانی رۆژانەیان, ئەم سستەمەش (شەش) قوناغە, لەم بەرنامەیەدا دەبێت بەو شتە ( یاری یان خواردن ) یان هەر شتێك کە لای منداڵەکە خۆشەویستە دەست پێ بکرێت, چونکە ئەگەر ئەوە شتەی کە دەمانەوێت ڕاهێنانی لە سەر بکەین لای خۆشەویست نەبوو, ئەوە خۆی بۆ ماندو ناکات, پاشان ئەو شتەی وەك قۆناغی یەکەم بە کار دێنین کە (وەك وتمان لای خۆشە ویستە) دەبێت دور بێت لە بەردەستی و نەتوانێت بە ئاسانی دەستی پێ بگات. (الشامی/٢٠٠٤/لاپەرە ١٤٠- ١٤٥)

لەم بەرنامەیەدا منداڵ زۆر پێویستی بە هاوکاری هەیە, ڕەنگە سەرەتا پێویست بکات بە هەموو جەستە ئاوکاری بکرێت, بەڵام ئەوەی گرنگە دەبێت هێواش هێواش ئەو هاوکارییانە کەم بکرێنەوە و منداڵ بتوانێت پشت بە خۆی ببەستێت لە ئەنجامدانی هەر چالاکییەکدا, بۆ ئەوەی ڕابێت لە داهاتوو لە ژیانی رۆژانە پشت بە خۆی ببەستێت, ئەگینا هەتا هەتایە پشت بە دایك و باوك دەبەستێت لە بچووکترین تواناادا.

## ٤-بەرنامەی سن رایز؛ صن رایز ( SON- RIES- PROGRAM ):

ئەم بەرنامەیە لە هەفتاكانی سەدەی ڕابردو دانراوە, لە لایەن دایك و باوكێكەوە, دوای ئەوەی مندالەكەیان بە ئۆتیزم دەستنیشان كراوە, مندالەكەیان ناوی ( ڕاین ) بووە, كاتێك دەستنیشان كراوە بە ئۆتیزم تەمەنی (١٩) مانگ بووە, شێوەی ئۆتیزمەكەی توند بووە, لە هەمان كاتدا ڕێژەی ژیرییەكەی (٣٠) بووە, واتا بیركۆلش بووە, بەلام دوای دانانی بەرنامەیەك كە بە بەرنامەی مال دادەنرێت راین زۆر پێشكەوت و توانی قسە بكات و پەیوەندی دروست بكات, بە شێوەیەك كە لە مندالی ئۆتیزم نەدەچوو, دواتر ڕاین توانی زانكۆش تەواو بكات و ببێتە كەسێك كە ڕاهێنان بە خێزانی مندالانی ئۆتیزم بكات لەو سەنتەرەی كە باوكی دایمەرزاند لە ئەمەریكا.

ئەم بەنامەیە بەوە جیا دەكرێتەوە لە بەرنامەكانی تر كە گرنگی بە لایەنی كۆمەلایەتی و پەیوەندی كۆمەلایەتی مندالی ئۆتیزم دەدات, ئەمەش بە بەشداری كردنی مندالەكە و بە هەند وەرگرتنی ئارەزووەكانی مندالەكە, ئەمەش بنەمای فێركردن و فێربوونە لە ڕێگەی یاری كردنەوە, لە هەمان كاتدا بە كارهێنانی ئارەزو و خۆشی لە گەل مندالەكە, بۆ نموونە كاتێك

منداڵەکــە بــە جۆرێــك یــاری بــە دەســتەکانی دەکــات و دەیانجولێنێتەوە لە بری ئەوەی داوای لێبکەی واز بێنێت لەو ڕەفتارە تۆش وەك ئەو یاری بە دەستەکانت بکە و بەشداری بکە لەم جوڵەیە, واباشترە لەم حاڵەتە لە بەرامبەری بووەستیت تا بتبینیت, بەمەش بەشدارییەکی کۆمەڵایەتیت کرد, هەندێك پێیان وابوو ئەم لاسایی کردنەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵەکە ئەو ڕەفتارانەی لا خۆش بێت و دووبارەی بکاتەوە, بەڵام ئەمە لای (ڕاین) باشترین نموونە بوو, کە بووە هۆی دروست کردنی پەیوەندی لە گەڵ باوکیدا.

سەبارەت بەو منداڵانەی زمان بە کار ناهێنن بۆ پەیوەندی کۆمەڵایەتی, یان بە شێوەیەکی تر بڵێین ئەو منداڵانەی کە قسە ناکەن, لەم بەرنامەیە ڕێگەیەك دانراوە, ئەویش ئەوەیە کەوا ئەو ووشانەی فێری دەبێت بۆ پەیوەندی کۆمەڵایەتیە, واتا سود وەرگرتن لەو دەنگ و ووشانە بە مەبەستی پەیوەندی کۆمەڵایەتی, لە هەمان کاتدا ئەمە وەك یارییەکە بۆ منداڵەکە, وەڵامدانەوە بۆ هەر دەنگێکی منداڵەکە خۆی لە خۆیدا گرنگە, ئەگەر دەنگەکە هیچ مانایەکیشی نەبوو, باشتر وایە سەرەتا ئەو ووشانە بە کار بێت کە جوڵەی لە گەڵدایە, بۆ نموونە کاتێك دەڵێیت لە سەرەوە, دەتوانیت خۆت بەرز بکەیتەوە بۆ ئاماژەکردنی بۆ سەرەوە, دواتر دەتوانین ناوی ئەو شتانە بڵێیت

کە دەتوانین بە ئاماژەش بە کاربێت, لە هەر کاتێکدا منداڵەکە ووشەکەی ووت یان تەنانەت پیتێکی لە ووشەکە ووت دەبێت دەستخۆشی لێبکرێت و هانبدرێت تا کارەکەی لا خۆشەویست و بەلەزەت بێت.

دەکرێت ئەم بەرنامەیە بە سێ قۆناغ ئەنجام بدرێت, قۆناغی یەکەم بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ کەسانی پسپۆر لەم بەرنامەیە خول بۆ خێزان دەکەنەوە, پاشان خێزان ئەو هەنگاوانەی فێربوون لە ماڵەوە لە گەڵ منداڵەکەیان جێبەجێی دەکەن بۆ ماوەیەکی دیاری کراو, پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو سەنتەرە پسپۆرەی منداڵەکەی تێدایە بۆ تەواو کردنی قۆناغی دووەم کە ئەنجامدانی چالاکییەکان بوو لە ماڵەوە. ( المغلوث/٢٠٠٦/لاپەڕە ٣٥-٣٧ )

زۆر بەرنامە هەیە کە بۆ منداڵی ئۆتیزم و ڕاهێنانی منداڵی ئۆتیزم دانراوە کە نەمانتوانی لە کتێبەدا ئاماژەیان پێ بکەین و بیانخەینە ڕوو , بۆیە مەرج نیە هەموو ئەو بەرنامانە بۆ کۆمەڵەی ئێمە بگونجێت, لە هەمان کاتدا نامانەوێت لێرەدا خێزان بخەینە گێژاوێکەوە لە نێو ئەو هەموو بەرنامانەدا, پاشان زۆر لەو بەرنامانە بە ئاسانی جێبەجێ ناکرێت, بۆیە

پێویستە خێزان و پسپۆڕان و ڕاهێنەران خولی تایبەت لە سەر ئەو بەرنامانە ببینن.

# سەرچاوەکان

١- ئەفرام محەمەد حەسەن، نەخۆشیە دەروونییەکان، چاپی دووەم ٢٠٠٢چاپی سێهەم ٢٠١٢، چاپخانەی ناوێنە.

١-ماجد نوری‌و د.ڕێزان دزەیی، ئۆتیزم، چاپخانەی خانی (دهۆك)، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

٢- -عادل عبدالله محمد، جداول النشاط المصور للاطفال التوحديين ، دار الراشد.

٣- جيهان احمد مصطفى، التوحد، كتاب اليوم (السلسلة الطبية)، العدد ٢٨٠ و ٢٨٩، دار اخبار اليوم، القاهرة، ٢٠٠٨.

٤-سوسن شاكر الجلبي، التوحد الطفولي (اسبابه - خصائصه - تشخيصه - علاجه)، الناشر مؤسسة علاء الدين للطباعة والتوزيع - دمشق - سوريا، الطبعة الاولى ٢٠٠٤.

٥- مورين ارونز - تيسا جيتنس،العلاج الامثل لمضرض التوحد - الاوتيزم - المشكلة والحل، دار الفاروق للنشر والتوزيع - مصر.

٦- ثناء حسن سليمان، اضطراب التوحد، الناشر: دار كيوان - دمشق، الطبعة الاولى ٢٠٠٧.

٧- عبدالجليل الاحمد، المرض الذي حير العلماء - التوحد، الناشر .. - دار الرضوان، حلب، ٢٠٠٥.

٨- احمد سليم النجار، التوحد واضطراب السلوك، الناشر دار اسامة للنشر والتوزيع، الاردن - عمان، ٢٠٠٦.

٩- د. فهد بن حمدالمغلوث/التوحد كيف نفهمه ونتعامل معه/ الطبعة الاولى ٢٠٠٦/مؤسسة الملك خالد الخيرية.

١٠- د..سهى احمد امين نصر/ الاتصال اللغوي للطفل التوحدي / الطبعة الاولى ٢٠٠٢/ دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع

١١- وفاء علي الشامي/علاج التوحد/ الطبعة الاولى ٢٠٠٤/

١٢- عبداللطيف مهدي زمام/ التوحد الذاتي عند الاطفال/٢٠٠٨/دار زهران للنشر والتوزيع-عمان الاردن
سەرچاوەکانی ئینتەرنێت
١-د. رابيه الحكيم www.childguidanceclinic.com
٢- اطفال الخليج ذوي احتياجات الخاصة – (www.gulfkids.com
٣- شكبة تحدي مرض التوحد في العالم العربي- http://www.autismarabia.com

# بەشی دووەم

- ئۆتیزم‌و خێزان
- کاریگەریی ئۆتیزم لەسەر خێزان
- فێرکردنی منداڵی ئۆتیزم
- ئەو هۆکارانەی دەبنە گرفت لەبەردەم فێرکردن
- هەڵسەنگاندی منداڵی ئۆتیزم
- دروست کردنی پەیوەندی
- ئۆتیزم‌و ژینگەی دەرەوە
- ئۆتیزم‌و وێنە
- ئۆتیزم‌و قوتابخانە
- پلان‌و بەرنامە
- گەشەکردنی توانای ڕۆژانە لەڕێگە چالاکییەوە
- بەکارهێنانی ناوی شتەکان
- ئۆتیزم‌و بەهرەمەندی
- ئۆتیزم‌و دەربڕین
- ئۆتیزم‌و خۆشەویستی
- ئۆتیزم‌و پاداشت
- هەندێ ڕێنمایی بۆ خێزان

# ئۆتیزم و خێزان

لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان لەئۆتیزم ـ خود تەنیاییو جۆرو هۆکارو نیشانەکان و چارەسەرکردن کرد، کە پشتمان بەکۆمەڵێك سەرچاوە بەستبوو، بەڵام لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین بەپشتبەستن بەئەزموونی خۆمان لەڕاهێناندا لەگەڵ منداڵانی ئۆتیزم بخەینەڕوو، چونکە دڵنیاین، کە خێزانی کۆمەڵگەی ئێمە پێویستی بەڕێنماییو هاوکاری هەیە، تا بتوانێت مامەڵەیەکی دروست لەگەڵ منداڵەکەیدا بکات، بەتایبەت کە بۆی دەردەکەوێت، منداڵەکەی ئۆتیزم لەگەڵدایە.

زۆر جار کە خێزانێك دەبینێت، منداڵەکەی لە(قسەکردن)و کۆمەڵێك توانای ڕۆژانە دواکەوتووە پەنا دەبات بۆ لای پزیشکی پسپۆری منداڵان، بەتایبەت ئەو خێزانانەی منداڵی تریان هەیەو ئەو منداڵانەش بێ کێشە بوونو هیچ دواکەوتنێکان نەبووە، یان ئەو خێزانانەی منداڵێکیان هەبووەو درەنگ پێیان زانیوە، کە تووشبووە بەئۆتیزم، بۆیە بۆ منداڵی دووەم زووتر هەست بەدواکەوتنەکان دەکەنو زووتر خەمی دەخۆنو دەیانەوێت چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو خێزانێك منداڵەکەی هەندێ کێشەی هەبێتو بەکێشەی

نەزانن، ئەوە دەبێتە هۆی دواکەوتنی چارەسەر یان باشتر بوون، بۆیە دەبێت خێزان زۆر وریا بێت، لەوەی کە منداڵەکەی هەندێ دواکەوتنی هەبوو، یان هەندێ ڕەفتاری نامۆی هەبوو، دەبێت خەمی بخوات، چونکە لەو حاڵەتانەی کە پەیوەستن بەڕەفتارو لەمامەڵە دەردەکەوێت، پێویستە خێزان زوو خەمی ئەو منداڵە بخواتو هەموو هەنگاوەکان بنێت، تا زووتر هاوکاریی بکات، ئەگەر هاتوو منداڵەکە ئۆتیزمی بوو، ئەوە تا زووتر دەستنیشان بکرێت باشترە، چونکە تا لەتەمەنی منداڵیدا ئیشی (ڕاهێنان) لەگەڵدا بکرێت، ئەوە زیاتر ئومێدی باشتربوونی هەیە، نەك چارەسەر، چونکە تا ئێستا بەداخەوە چارەسەرێکی تەواو نییە بۆ ئۆتیزم.

بەداخەوە زۆر جار خێزانێك بەهۆی هەندێ کلتوورو دابونەریتی کۆمەڵایەتییەوە منداڵەکەی دەشارێتەوەو پێی شەرمە، کە منداڵێکی ئۆتیزمی هەبێت، یان ڕەنگە هەر نەزانێت ئۆتیزمە، بەڵام ئەم شاردنەوەیە گەورەترین زیان بەو منداڵە دەگەیەنێتو لەبەرەو پێشچوون لەتواناکاندا دوای دەخات، واتا تا زووتر منداڵەکە دەستنیشان بکرێت، ئەوە زووتر بەرەو پێش دەچێت، بێگومان بەڕاهێنانو دەستێوەردانی پێشوەخت بەرەو پێش دەچێت، نەك بەدانان لەچوارچێوەی چوار دیواردا، ئەو

ڕاهێنانەش دەبێت کەسانێکی شارەزا ئەنجامی بدەن، ئەگەر ئەو کەسە شارەزایانە نەبوون یان کەم بوون، ئەوە لەهەموو حاڵەتێکدا ئەو کەسە شارەزایانە هەرچەندە زۆر بن، وەك خێزان ڕۆڵ نابینن لەهاوکارییکردنی منداڵی ئۆتیزمدا، بۆیە ئێستا لەزۆر وڵات زیاتر خێزانەکان فێردەکرێن بۆ ڕاهێنانی منداڵی ئۆتیزم، چونکە بەداخەوە لەهەموو دونیا ئەم حاڵەتە (ئۆتیزم) لەزیادبووندایە.

دوو منداڵی ئۆتیزم لەیەك ناچن، لەڕووی نیشانەو هۆکارو ڕەفتارو زۆر شتی ترەوە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە تائێستا چارەسەرێکی گشتی بۆ منداڵی ئۆتیزم نەدۆزراوەتەوە، بۆیە کاتێك باس لەڕاهێنانێك دەکەین، مەرج نییە بۆ هەموو منداڵێکی ئۆتیزم بگونجێت، واتا دەبێت هەموو منداڵێکی ئۆتیزم بەرنامەی تایبەتی بۆ دابنرێت، ئەمەش بەهەڵسەنگاندن دەتوانرێت لایەنە بەهێزو لاوازەکانی دەستنیشان بکرێت و پاشان بەرنامەی بۆ دابنرێت، بەلام لەهەموو حاڵەتەکاندا ئەوەی گرنگە خێزان بیزانێت دوو خاڵە، یەکەم: دەبێت خێزان زۆر ئارام بێت لەگەڵ منداڵەکەی لەهەموو کاتەکاندا، چونکە منداڵی ئۆتیزم درەنگ فێردەبن و شت وەردەگرن. دووەم: دەبێت خێزان سوور بێت لەسەر ئەوەی کە منداڵەکەی فێردەبێت، واتا هەوڵدان

لەهەر بوارێکدا لەگەڵی بدرێت ئەنجامی دەبێت، ئەمەش ڕاستییەکەو دەبێت خێزان بیزانێت.

هەموو ئەو هەنگاوانەی پێویستە بۆ منداڵی ئۆتیزم بنرێت لەلایەن خێزانەوە، بێگومان گرنگی هەیە، بۆیە پێویستە خێزان ئەوە بزانێت، ئەرکێکی قورسی لەئەستۆیە، دڵنیاشین لەوەی ئەو خێزانانەی منداڵی ئۆتیزمیان هەیە، زۆر ماندوون‌و بوونی ئەو منداڵە کاری کردوەتە سەر هەموو ئەندامانی خێزان بێ جیاوازی، بۆیە ئاسان نییە، خێزانێک هەموو ژیانی بەهۆی منداڵێکی ئۆتیزمەوە بە بەرنامەو پلان بەڕێوە بڕوات، بەڵام ئەوەی گرنگە بیزانرێت، ئەوەیە ئەو بەرنامەو پلانانە زۆر شت بۆ خێزان‌و منداڵەکەش ئاسان دەکات، ئەمەش دەکەوێتە سەر سووربوونی خێزان لەسەر ئەو بەرنامەو پلانانەو ئاستی وەرگرتنی منداڵەکە.

# کاریگەریی ئۆتیزم لەسەر خێزان

هەموو حاڵەتێکی کەمئەندامی یان خاوەن پێداویستی تایبەت لەزۆر ڕووەوە کاریگەریی لەسەر خێزان هەیە، بەتایبەت حاڵەتە دەروونیو عەقڵییەکان، یان دەتوانین بڵێین ئەو حاڵەتانەی کە جەستەیی نینو دەستنیشانکردنیان ماوەیەکی زۆری دەوێت، ئۆتیزمیش دەچێتە ژێر ناوی ئەو حاڵەتانەوە، کە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر خێزان هەیە لەچەند ڕووەیەکەوە، وەك:

- لەڕووی مادییەوە: بەهۆی ئەوەی حاڵەتی ئۆتیزم دەستنیشانکردنی ئاسان نییەو ماوەیەکی زۆری دەوێت، بۆیە زۆربەی خێزانەکان چەندین وڵاتو چەندین پزیشکی پسپۆر دەکەن، تەنها بۆ ئەوەی بزانن، منداڵەکەیان چییەتی.
- لەڕووی دەروونییەوە یان مەعنەوییەوە: کاتێك خێزانێك منداڵەکەی بەئۆتیزم دەستنیشان دەکرێتو بەهۆی نەبوونی شارەزاییو ئەزموونەوە خێزان تووشی حاڵەتێکی دەروونی نالەبار ئەمەش کار دەکاتە سەر ژیانی بەشێوەیەکی گشتی.

- لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە: بەهۆی ئەوە منداڵی ئۆتیزم جووڵەی زۆرەو توانای گوزارشتی نییە، بۆیە زۆر جار لەلایەن کۆمەڵگەوە ڕەتدەکرێتەوەو سەرزەنشتی خێزان دەکرێت، بۆیە ئەمەش دەبێت هۆی دابڕانی خێزان لەکۆمەڵگەو لەبۆنە کۆمەڵایەتییەکاندا.

لەهەمان کاتدا لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی ئۆتیزم لەمنداڵەکەیداو تا کاتی دەستنیشانکردنی خێزان بەچەندین قۆناغدا تێدەپەڕێت، لێرەشدا ئەو قۆناغانە دەخەینە ڕوو:

١. زەبری دەروونی (صدمة النفسية): کاتێك خێزان چاوەڕوانی لەدایکبوونی منداڵێك دەکات، بێگومان چاوەڕوانی منداڵێکی ساغ و لەشدروست دەکات، کە هیچ کەموکوڕییەکی نەبێت، بەتایبەت کەموکوڕی جەستەیی، چونکە ئێستا بەهۆی زانستەوە دەتوانرێت پێش لەدایکبوون، کەموکوڕییە جەستەییەکان ببینرێت، بەڵام هیچ کات خێزان چاوەڕوانی منداڵێکی کەمتوانا یان چاوەڕوانی منداڵێك ناکات، کە کێشە لەمێشکیدا هەبێت، بۆیە کاتێك منداڵەکەی لەکۆمەڵێك توانا دوادەکەوێت و پزیشکێکی پسپۆڕ پێیان ڕادەگەیەنێت، کە منداڵەکەیان تووشبووە بەئۆتیزم، خێزان لێرەدا تووشی

زەبرێکـی دەروونـی خـراپ دەبێـت، بەتایبـەت کـە هـیچ زانیارییەکیان لەسەر ئۆتیزم نەبێتو پێیان بوترێت ئەم حاڵەتە چارەسـەری نییـە، ئەمـەش کاریگەرییـەکی زۆر خراپـی دەبێـت لەسەر خێزان.

٢. ڕەتکردنـەوەو ئینکـارکردن: بێگومـان بـەهۆی ئـەوەی منداڵی ئۆتیزم لەڕووی جەستەییەوە هیچ کەموکورییـەکی پێوە دیـار نییـەو کێشەکان لەدواکـەوتنی گەشـەی مێشکدایە، بۆیـە خێـزان بەهەمـوو شێوەیەك ڕەتـی دەکاتـەوە، کـەوا منداڵەکـەی تووشـبوو بێـت بـەئۆتیزم، دەچنە لای پزیـشکی تـرو چـەندین شیکاری بۆ دەکەنو ڕەنگە چەندین وڵاتی تر بکەن، تەنها لەبـەر ئەوەی کەوا دڵنیابن، لەوەی منداڵەکەیان هیچی نییە، یان ڕەنگـە هـیچ نەکـەنو بڵـێن منداڵەکـەمان ئاساییەو تـەنها قسەکردنی دواکەوتوەو خۆی باش دەبێت، یان بـەهۆی ئـەوەی کـەوا هۆکارو نیشانەکانی ئۆتیزم ئاشکراو ڕوون نییە، کە خێزان پەنا ببات بۆ چـەندین شێوازی چارەسـەرکردن، بـۆ نموونـە چـوون بـۆ لای (شـێخو مـەلا)، هەنـدێ جـار بـاوەڕ بـەوە دەکـەن، کـە پێیـان دەوترێت منداڵەکە جنۆکە لە لەشیدا هەیەو دەبێت دەربکرێت، یان پەنا بۆ چارەسەری سروشتیو دەرمانی گیایی دەبەن، ئەمەو چەندین شێوازی تر، کە بەپێی کۆمەڵگەکان دەگۆڕێت.

٣. هەستکردن بەتاوان: دوای قۆناغی زەبری دەروونیو ڕەتکردنەوە خێزان دەگاتە ئەو باوەڕەی، کە منداڵەکەی دواکەوتوەو تووشبووە بەئۆتیزم، لێرەداو لەم قۆناغەدا خێزان هەست بەتاوان دەکاتو هەموو هۆکارەکە بۆ خۆی دەگەڕێنێتەوەو بەهەموو شێوەیەك لۆمەی خۆی دەکات، بۆ نموونە دەڵێت ئەگەر من ئەوەم نەکردایە، ڕەنگە منداڵەکەم وای لێ نەهاتایە، یان زۆر جار خێزان ڕەنگە وا هەست بکات، کەوا تاوانێکی کردوە، بۆیە خوای گەورە ئەم منداڵەی پێبەخشیوە، ئەو قۆناغانەی سەرەوە تووڕەبوونێك لای خێزان دروستدەکات، کە ئەنجامەکەی دەبێتە کێشەی خێزانیو ژنو مێرد، تەنانەت یەکتریش تاوانبار دەکەن، بەوەی کەوا ئەو هۆکار بووە بۆ دروستبوونی ئەم منداڵە.

٤. قبوڵکردنو چارەسەر: دواقۆناغ کە گرنگترین قۆناغە ئەوەیە، کەوا خێزان دەگاتە ئەو باوەڕەی، کەوا منداڵەکەی دواکەوتوەو تووشبووە بەئۆتیزمو دەبێت هاوکاریی بکات، لێرەدا بەدوای پسپۆڕانو شارەزایان دەگەڕێتو هەوڵی چارەسەردەداتو هەر چارەسەرێکی کە پسپۆڕان پێی بڵێن، باوەڕی پێ دەکات.

لێرەدا ئەوەی گرنگە بوترێت، لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی ئۆتیزم لەسەر منداڵێك خێزان بەو قۆناغانەدا

تێدەپەڕێت، مەرج نییە هەموو خێزانێك بەو هەموو قۆناغەدا تێبپەڕێت، ڕەنگە خێزان هەبێت بەقۆناغی زیاتر لەو قۆناغانەدا تێبپەڕێت، مانەوەی خێزان لەقۆناغەکاندا لەخێزانێکەوە بۆ خێزانێکی تر جیاوازە، ئەوەی گرنگە خێزان بەکەمترین کات بگاتە قۆناغی کۆتایی (قبولکردن‌و چارەسەر)، چونکە دواکەوتنەو درەنگ گەیشتنە بەقۆناغی کۆتایی زیانی زیاتر بەمنداڵەکە دەگەیەنێت.

لەهەموو ئەو قۆناغانەدا پزیشك‌و پسپۆڕانی کۆمەڵایەتی‌و دەروونی ڕۆڵی بەرچاو دەبینن، لەڕووی کەمکردنەوەی زەبرە دەروونی و لە ڕووی گەیشتن بەقۆناغی کۆتایی (قبولکردن‌و چارەسەر)، بەڵام بەداخەوە لەوڵاتی ئێمە ئەو پسپۆڕانە بوونیان کەمەو تا ئێستاش نەبووەتە نەریتێك، کەوا لەکاتی دەستنیشانکردنی منداڵێکی ئۆتیزم هاوکاریی پێشکەش بەخێزان بکەن‌و ئارمییان پێ ببەخشن، ئەگەر ئەو ڕێنمایانەش هەبێت ئەوە بە شێوەیەك نیە کەوا خێزان بە تەواوەتی ئارام بکاتەوە.

# فێرکردنی منداڵی ئۆتیزم

کاتێك دەڵێین فێرکردنی منداڵی ئۆتیزم، واتا ڕاهێنانو هەوڵدان بۆ بەرەو پێشبردنی منداڵی ئۆتیزم، لێرەشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ڕاهێنان باشترین چارەسەرە بۆ ئەوان، فێرکردن لێرەدا بەمانای ئەو فێرکردنە نایەت، کە لەقوتابخانەدا منداڵ فێردەکرێت، بۆیە دەبێت خێزانو ئەو کەسانەی مامەڵە لەگەڵ منداڵی ئۆتیزمدا دەکەن، بزانن فێرکردن چی دەگرێتەوەو کام فێرکردن پێویستە پێش ئەوی تر بکەوێت، لێرەدا کۆمەڵێك لەو توانستو لایەنانە دەخەینە ڕوو کە پێویستە کاری لەسەر بکرێت:

- **توانستەکانی ڕۆژانە لای منداڵی ئۆتیزم:**

منداڵی ئۆتیزم بەوە ناسراوە، کە پێویستی بەهاوکاریی بەردەوام هەیە، بۆیە پشت بەدەوروبەر دەبەستێت لەبچووکترین توانا تا گەورەترین توانا، ئەگەر هاتوو دەوروبەر بەردەوام هاوکارییان کردو هەموو کارەکانیان بۆ ئەنجامدا، ئەوە بێگومان ئەو منداڵە بەهیچ شێوەیەك بەرەو پێش ناچێتو پشت بەدەوروبەر دەبەستێت لەدابینکردنی بچووکترین پێداویستی ڕۆژانەیدا.

کۆمەڵێك توانای سەرەکی لەهەموو مرۆڤێکدا هەیە، پێویستە بوونی هەبێت، ئەم توانستانە لای منداڵی ئاسایی

لەگـەڵ تەمەنیـدا گەشـەدەکات، بـەڵام لای منـداڵی ئـۆتیزم بەزەحمـەت گەشـەدەکات، بۆیـە پێویـستە لەسـەرەتاوە ڕاهێنـانی ئەو توانستانەی لەگەڵدا بکرێت، بێگومان توانستەکان زۆرن، کـە مرۆڤ لەژیانی ڕۆژانەی پێویستی پێ دەبەێت.

سەرەتا دەبێت، ئەوە بزانین، کە منداڵ بەگشتی پێویـستی بـەوە هەیـە، کـە لەسـەر توانـستەکانی ڕۆژانـە فێربکرێـت، وەك نـانخواردنو چـوونە توالێـتو جـل گـۆڕین، گـۆرەوی و پـێڵاو لەپێکردنو ....هتد، ئەم توانـستانە بـۆ منـداڵی ئـۆتیزم قورسـەو پێویستی بەهاوکاری هەیە، بەڵام ئەگەر هاتوو ڕاهێنـانی لەگـەڵ کرا، ئەوە بێگومان ڕادێت، بەڵام دیسانەوە لێرەش دەڵێین خێـرا ڕاهاتنو درەنگ ڕاهاتن لەمنداڵێکی ئۆتیزمەوە بـۆ منـداڵێکی تـر دەگۆڕێت. گرنگترین توانستەکانی ژیانی ڕۆژانە بریتییە لە:

١.نانخوادن بەسەربەخۆیی
٢. خۆگۆڕینو جل لەبەرکردن
٣. ددان شتن
٤. بەکارهێنانی تەوالێت لەماڵ و شوێنە گشتییەکان
٥. خۆشتن
٦. ئەنجامدانی هەندی کاری ئاسانی نـاو مـاڵ وەك سرینی مێز, کۆکردنەوەی یارییەکانی خۆی.
٧. قژ داهێنان
٨. هەڵبژاردنی جلوبەرگی گونجاو بۆ کەشو هەوای گونجاو.

٩. بتوانێت زەڵاتەیەك بۆ خۆی ئامادە بكات.
١٠. بتوانێت خواردنێك ئامادە بكات.
١١. بتوانێت لەفەیك بۆ خۆی دروست بكات.
١٢. گرنگی دان بە نینۆك و پاك و خاوێنی.

ئەمەو چەندین تواناتر کە خێزان دەتوانێت منداڵەکەی لە سەر ڕابهێنێت، بۆ ئەوەی منداڵی ئۆتیزم لە داهاتوودا بتوانێت پشت بە خۆی ببەستێت و چاوەڕوانی کەس نەکات کاتێك پێویستیەکی هەبوو، بۆ نموونە ئەگەر برسی بوو، کەسیش نەبوو خواردنی بۆ ئامادە بکات.

- **توانستەکانی پێش قوتابخانە**

ئەگەر منداڵی ئۆتیزم توانای قسەکردن هەبوو، لە توانستەکانی ڕۆژانە کێشەی نەبوو، دەبێت بۆ چوونە قوتابخانە ئامادە بکرێت، وەك منداڵێکی ئاسایی دەبێت ئەم توانستانەی باش بێت و ئامادە کرا بێت:

١. ناسینی ڕەنگەکان.
٢. ناسینی شێوەکان.
٣. ناسینی ژمارەکان.
٤. ناسینی قەبارە.

٥. جیاکردنەوەی دەنگەکان.
٦. توانای ماسولکەی بچووك (قەڵەم گرتن).
٧. ناسینی ئاراستەکان (ڕاستو چەپ، باکوورو باشوور).
٨. زانینـــی جیاوازییـــەکان لـــەنێوان لەیەکـــچووەکانو دژەکان.

ئەمـەو چـەندین توانـای تـر، کـە پێویـستە منـداڵ پـێش چوونە قوتابخانە بیانزانێت، یان چەندین توانا هەیە، کە دەبێت فێریـان ببێت بۆ ژیـانی ڕۆژانـەی، بـەڵام ئـەم تواناـنـە لەشـەو و ڕۆژێکـدا فێـر نابێتو پێویـستی بـەڕاهێنانی بـەردەوام هەیـە، پاشـان ئـۆتیزم لـەو جۆرانەیـە کـە لەهـەموو تەمـەنی پێویـستی بـەهاوکاریی دەوروبـەر هەیـە، بۆیـە نابێـت خێـزان لەسـەرەتای ڕاهێنانەکانـدا تووشـی نائومێـدی ببێـت، کاتێـك دەبینێـت منداڵەکەی بەئاسانی فێرنابێت.

# گرفتەکانی بەردەم پرۆسەی فێرکردن

بێگومان زۆر هۆکارو فاکتەر هەیە، کە دەبنە گرفتو ڕێگر لەبەردەم فێربوونو بەرەو پێشچوونی منداڵی ئۆتیزمدا، بێگومان گرنگترین ئەو فاکتەرانە دواکەوتنی دەستنیشانکردنی حاڵەتی ئۆتیزمە لای ئەو منداڵە، بەڵام ئەگەر قسە لەسەر دوای دەستنیشانکردن بکەین، ئەوە کۆمەڵێك گرفت هەیەو لێرە دەیخەینە ڕوو، تا خێزان زووتر هەوڵی چارەسەری ئەو گرفتانە بکات:

## ١- هەڵسوکەوتی دووبارە

هەڵسوکەوت یان ڕەفتاری دووبارە یەکێکە لەنیشانە سەرەکییەکانی ئۆتیزمو ڕێگرو بەربەستە لەبەردەم پرۆسەی فێرکردندا، ئەم هەڵسوکەوتانە بریتییە لە جوڵەی لەش یان بەشێکی لەش بە بەردەوامی یاخود خولانەوە بە دەوری خۆیدا ، یان یاری کردن و خوگرتن بە یاریەکی تایبەتەوە، ڕەفتاری دووبارە و یەك ڕێچکە زۆر شت دەگرێتەوە ، بەڵام ئەوەی گرنگە بزانرێت ڕەنگە هۆکاری ئەو ڕەفتارو هەڵسوکەوتە دووبارانە نەبوونی بەرنامە و کاتی بەتاڵی زۆر بێت، چونکە منداڵی ئۆتیزم ناتوانێت خۆی بۆ خۆی کاتەکانی ڕێکبخات و کەی هیچ

کارێکی نەبوو برواتە لای یارییەکانی، بۆیە ڕێکخستنی بەرنامەی ڕۆژانە کارێکی زۆر گرنگە و دەبێت ڕەچاو بکرێت و کاتە بەتاڵەکان بە کۆمەڵێك یاری زانستی و فێرکاری پڕ بکرێتەوە بۆ گەشە کردنی تواناکانی ڕۆژانەی منداڵەکە، چونکە بە نەبوونی ئەو بەرنامەیە جولە و ڕەفتاری دووبارەی منداڵ زیاد دەکات و بە هەموو شێوەیەك پرۆسەی فێرکردن قورس دەبێت .

## ٢- جوڵەی زۆرو کەمی دانیشتن

زۆربەی منداڵانی ئۆتیزم ـ خودتەنیایی جووڵەی زۆریان لەگەڵدایە، کە ئەمەش کاری کردوەتە سەر خێزان بەشێوەیەکی گشتیو بووەتە هۆی دابڕاندنی خێزان لەکۆمەڵگەو بۆتە کۆمەڵایەتییەکاندا، ئەمەش وای کردوە، خێزان پەنا بۆ چەندین ڕێکەچارە بۆ هێورکردنەوەو دانیشتنی منداڵەکانیان ببات، تەنانەت پەنا بۆ بەکارهێنانی چارەسەر دەبەن،کە لەلایەن پزیشکەوە بۆیان دەنووسرێت، چونکە دانیشتنی منداڵ یەکەم هەنگاوە بۆ هەموو ڕاهێنانێك، کە پێویستە لەگەڵی ئەنجام بدرێت، ئەگەر منداڵی ئۆتیزم لەسەر مێزو کورسی دانەنیشێت، ئەوە هەموو ڕاهێنانێك لەگەڵیدا بێ سوود دەبێت، پاشان ڕاهێنانی لەسەر دانیشتن هاوکارە بۆ دانیشتنی لەسەر مێزو کورسی لەشوێنە گشتییەکاندا ، بۆیە جووڵەی زۆرو کەمی

دانیشتن وەك هۆكارێك دەبێتە ڕێگر لەبەردەم فێركردن و ڕاهێناندا.

دەبێت خێزان ئەو ڕاستییە بزانێت، كە ڕاهێنانی منداڵی ئۆتیزم لەسەر دانیشتن لەسەر مێزو كورسی پێویستی بەڕاهێنان هەیەو ڕەنگە ئەو ڕاهێنانە بەچەند ڕۆژێك ئەنجام بدرێت و ڕەنگە چەند مانگێك بخایەنێت، یان ڕەنگە پێویستی بەكاتێكی زیاتر بێت، بەڵام دەبێت خێزان لەو هەوڵانە بێ هیوا نەبێت و دڵنیا بێت منداڵەكەی لەسەر دانیشتن ڕادێت، ئەگەر ئەوان سووربن لەسەر ئەوەی كە ڕایبێنێت لەسەر دانیشتن.

سەرەتا پێویستە بۆ ڕاهێنانی منداڵی ئۆتیزم لەسەر دانیشتن مێزو كورسییەكی تایبەت هەبێت، لەوێوە هەوڵی دانیشتنی لەگەڵ دەدرێت بەتایبەت یاریی كردن، واتا ئەو یارییانەی كە ڕۆژانە لەماڵەوە دەیكات، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە لەسەرەتادا چەند یارییەك ئامادە بكرێت، بۆ ئەوەی لەهەر یارییەك بێزار بوو، ئەوە یارییەكی تری بخرێتە بەردەست، بەم شێوەیە ڕەنگە سەرەتا بۆ ماوەی پێنج چركە دابنیشێت یان ڕەنگە زیاتر، بەڵام ئەوەی گرنگە، كە ئەمە سەرەتایەكە بۆ فێركردنی منداڵ لەسەر دانیشتن، لەهەمان كاتدا دەبێت خواردنیش لەسەر مێزو كورسی بێت، بۆیە نابێت،

بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی بدرێتن خواردن بباتە جێگایەکی تر بیخوات، دەبێت خواردنەکەی لەسەر مێزو کورسی بۆی دابنرێت، ڕەنگە توورە ببێتو هاواربکاتو خواردنەکە بەجێبهێڵێت، بەڵام لەئەنجامدا برسی دەبێتو دەگەڕێتەوە، ئەوەی گرنگە دەبێت خێزان بەتوڕەبوونو هەڵچوونو هاوارکردنی منداڵەکە لاواز نەبێتو هەموو شتەکانی بخاتە بەردەست، بەو شێوەیە منداڵەکە ڕادەێت بۆ هەموو شتێك هەڵدەچێتو بەو شێوەیە هەموو مەبەستەکانی بەدەست دێنێت.

خاڵێکی تر کە زۆر گرنگە ڕەچاوبکرێت، لەکاتی ئەنجامدانی ڕاهێناندا ئەوەیە نابێت جیاوازیەك لەنێوان دانیشتنی منداڵەکەو کەسی ڕاهێنەر هەبێت، بۆ نموونە نابێت منداڵەکە لەسەر کورسییەکی منداڵان دانیشتبێتو دایك یان باوك (کەسی ڕاهێنەر) بەپێوە بێت، یان لەسەر کورسییەکی بەرز دانیشتبێت، واتا دەبێت لەگەڵ منداڵەکە لەیەك ئاستدا بنو هەوڵ بدرێت، پەیوەندیی چاوی بەهێز بکرێت، چونکە منداڵی ئۆتیزم پەیوەندیی چاوی (سەیریکردنی چاوی بەرامبەر) نییە یان لاوازە، پەیوەندیی چاو سەرچاوەی هەموو چالاکییەکانی ترە، کە لەگەڵی ئەنجام دەدرێت.

## ٣- سەیرکردنی تەلەفیزیۆن

تەلەفیزیۆن و ئامێرەکانی تری پێشکەوتن (کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت و مۆبایل) کاریگەریی زۆر خراپی لەسەر منداڵ بەگشتی و منداڵی ئۆتیزم بەتایبەت هەیە، چونکە منداڵ لەکاتی دانیشتنی بەدیار ئەو ئامێرانەوە تەنها زانیاری وەردەگرێت و ناتوانێت هیچ شتێك ببەخشێت و پەیوەندی دروست بکات، سەبارەت بەمنداڵی ئۆتیزم ئەمە کێشەیەکی گەورەیە، چونکە ئەوان کێشەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و تێکەڵبوونیان هەیە لەگەڵ منداڵی ترو هاوتەمەنی خۆیان، ئەمەش بێگومان ڕێگر دەبێت لەبەردەم فێرکردن و ڕاهێناندا.

زۆر جار خێزانێك دەیگێڕێتەوە، کەوا منداڵەکەی بۆ چەندین کاتژمێر بەدیار تەلەفیزیۆنەوە بەبێدەنگی دانیشتوە، بێ ئەوەی کەس بێزار بکات، کە پێیان وابووە، منداڵەکەیان بێ کێشەو هێمنە، بەڵام لەگەڵ دواکەوتنی لەتواناکان بۆیان دەرکەوتوە، کە منداڵەکەیان کێشەی زۆرە، ئەمە ئەگەر منداڵەکە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی هەبووایە، یان تێکەڵ بەهاوتەمەنی خۆی بکرایە، ئەوە زووتر هەست بەو کێشەو دواکەوتنانە دەکرا.

دەبێت بەرنامەکانی منداڵی ئۆتیزم لەڕاهێنان و تەلەفیزیۆن و دەرچوون بۆ شوێنە گشتییەکان، هەمووی

بەبەرنامە دارێژرابێت‌و کاتی دیاریکراویان خۆی هەبێت، سەبارەت بەتەلەفیزیۆن پێویستە کەمترین کاتی بۆ دابنرێت، تەنانەت ئەگەر لەهەفتەیەکدا یەك یان دوو جار بێت‌و بۆ ماوەی یەك کاتژمێر یان کەمتر، ئەوە باشترین بەرنامە دەبێت‌و منداڵی ئۆتیزم دوور دەکەوێتەوە لەتەلەفیزیۆن.

## ٤- بەتاڵی و بۆشایی

یەکێك لەکێشەکانی منداڵی تووشبوو بەئۆتیزم ـ خود تەنیایی ئەوەیە، کە نابێت بەهیچ شێوەیەك کاتی بەتاڵی هەبێت، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی دووبارەبوونەوەی هەندێ ڕەفتار، کە بەڕەفتاری دووبارە ناودەبرێت، ئەمەش وای لێدەکات، زۆرترین کات بەتەنیایی بەسەر ببات‌و خوو بەشتێکەوە بگرێت، کە سوودی پێ نابەخشێت، لەهەمان کاتدا زیاتر گۆشەگیر دەبێت، یان دەبێتە هۆی جوولەی زیاترو ئازاردانی خۆیی‌و دەرکردنی هەندێ دەنگ، کە دەوروبەری پێ بێزار دەبێت، بۆیە پێویستە بەردەوام بەرنامە بۆ سەرقاڵکردنی منداڵی ئۆتیزم هەبێت‌و ببەسترێتەوە بەو جیهانەی لەدەوروبەریدا هەیە، واتا پەیوەندیی لەگەڵ ئەو کەسانەدا دروست بکات، کە لەدەوروبەری دەژین، مەبەستمان لەبەرنامە لێرەدا ئەو بەرنامانەیە، کە سوود بەمنداڵی ئۆتیزم دەگەیەنێت‌و بەرەو پێشەوەی دەبات، بە تایبەت ئەو بەرنامانەی پەیوەندیی بەلایەنی هەستەکانەوە هەیە.

## ٥-هەڵسوکەوتی تەنگەژاوی و بەرەنگاربوونەوە

زۆر جار هەندێ هەڵسوکەوتی منداڵی ئۆتیزم دەبێتە گرفت و ڕێگر لەبەردەم پرۆسەی فێرکردن و ڕاهێناندا، ئەو هەڵسوکەوتانەش زۆر لایەن دەگرێتەوە، وەك ئازاردانی خۆی یان ئازاردانی کەسانی دەوروبەر، شکاندنی یاری و کەرەستەکانی ڕاهێنان، یان هاوارو قیژەو بێزارکردنی دەروبەر، ڕەنگە هەندێ جار لەپۆلدا ئەم ڕەفتارانە ئەنجام بدات، ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەڵسوکەوتی بەرەنگاربوونەوەیە لەچالاکییەك یان ڕاهێنانێك، کە نایەوێت ئەنجامی بدات.

## ٦- کێشە هەستیارییەکان

کێشە هەستیارییەکان گرفتێکی گەورەیە لەبەردەم فێرکردن و ڕاهێنانی منداڵانی ئۆتیزمدا، دەبێت ئەو کێشانە بەهەند وەربگیرێت و خێزان هەوڵبدات، هەموو ئەو لایەنە هەستیاریانەی منداڵەکەی بزانێت، کە ڕەنگە لەکاتێك لەکاتەکان ببێتە کێشە لەبەردەم فێرکردن و تەنانەت لەهەندێ حاڵەت و جێگادا ڕەنگە کێشەی گەورە دروست بکات، دەبێت خێزان بزانێت ئەو کێشە هەستیاریانە چییە، تا بەپێی هەستەوەرییەکانی یاری و فێرکردنی لەگەڵدا ئەنجام بدرێت، بۆنموونە هەندێ منداڵ هەستیاری بیستنیان هەیە، واتا

بەهەنــدێ دەنــگ بێــزاردەبن‌و دوور نییــە، هــاوار نــەکات‌و نەقیــژێنێت‌و پــەلاماری کەسانی تـر بدات، یـان ڕەنگـە هەنـدێ منداڵ بەجۆرێك بۆن بیزار ببن، واتا کێشەی بۆنکردنیـان هەیە، یان بەهەندێ ڕەنگ‌و تیشك بێزاببن، ڕەنگە منداڵ هەبێت، حەز نـەکات، دەسـتی بگریـت، یـان لـەئامێزی بگریـت، منـداڵ هەیـە، کێـشەی تـامکردنی هەیـە، بۆیـە دەبیـنین هـەموو یارییـەك یـان کەرەستەی ڕاهێنان دەیات بۆ دەمی، ئەمانـەو چـەندین کێشەی تـر، کـە دەبنـە ڕێگـر لەبـەردەم پرۆسـەی فێرکـردن‌و ڕاهێنانـدا، بۆیــە پێویــستە بزانێــت منداڵەکــەی چ کێــشەیەکی هەســتیاری هەیە، تا ئەو کێشەیە چارەسـەر بکات، پـێش دەسـتکردن بەهـەر ڕاهێنانێـك ، بـۆ نموونـە خێزانێـك دەزانێـت منداڵەکـەی کێشەی بیستنی هەیەو بێزاردەبێت‌و هاواردەکات‌و دەست بەگوێکانیـەوە لەژوورێکدا یان لەجێگایەکدا دەگرێت، بۆیە دەبێت بـەدوای ئـەو دەنگانە بگەڕێن، کـە ڕەنگـە بـوو بێتـە هـۆی بێزارکردنـی، ئەگـەر نەتوانرا ئەو دەنگە بدۆزرێتەوە، دەبێت ئـەو جێگایـە بگۆردرێـت‌و منداڵەکە بۆ جێگایەکی تر ببرێت، بەم شێوەیە بـۆ هـەموو لایەنـە هەسـتیارییەکانی تـر دەبێـت خێـزان بزانێـت، منداڵەکـەی لـە چ ڕوویەکـەوە کێشەی هەیـە، تـا بـۆی چارەسـەربکات، بـەم شـێوەیە کەشێکی ئارام بۆ منداڵەکە دەخوڵقێت‌و زۆر بەباشـی چالاکییەکان ئەنجام دەدات‌و سوودیش وەردەگرێت.

# هەڵسەنگاندی منداڵی ئۆتیزم

بێگومان منداڵی ئۆتیزم لەهەندێ لایەنو تواناداا زۆر بەهێزنو توانایەکی جیاوازیان هەیە بەبەراود بەکەسانی تر، ڕەنگە زۆر جار ئەمەش ببێتە کێشە بۆیان، لەهەمان کاتدا لەبەرامبەر ئەو توانایە لاوازییەکی زۆریان لەهەندێ لایەنی تر هەیە، ڕەنگە لاوازییان لەهەندێ توانای زۆر سادەدا هەبێت، بەتایبەت توانای گرنگیدان بەخۆیان لەژیانی ڕۆژانەدا، کە ئەمەش دیسانەوە کێشەیان بۆ دروست دەکات، چی لەناو خێزاندا، چی لەناو کۆمەڵگەو شوێنە گشتییەکاندا.

پێویستە هەموو خێزانێك لەکاتی ڕاهێنانی منداڵەکەی لیستێکی هەبێت، کە ماوەی جارێك هەڵسەنگاندن بۆ منداڵەکەی بکات، بەڵام ئەوەی گرنگە لەو لیستە دەربکەوێت، منداڵەکە لەهەندێ لایەن هیچ کێشەی نییەو توانایەکی باشی هەیە، لەبەرامبەردا وەك باسمان کردن لەهەندێ لایەندا زۆر لاوازەو کێشەی زۆری هەیە، دەبێت خێزان لەو کاتدا گرنگییەکی باش بەلایەنە لاوازەکە بدات، ئەوەش بەبەکارهێنانی هەموو ئەو کەرەستانەی دەبنە هۆی بەهێزکردنی ئەو لایەنانە، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت، بەهیچ شێوەیەك لایەنە بەهێزەکە پشتگوێ

بخرێت، چونکە ئەگەر ئەو لایەنە بەهێزانە پشتگوێ بخرێت، دەبێت کاتێکی تر خەمی ئەو لایەنانە بخورێت و گرنگی پێ بدرێت، بەم شێوەیە دەبێت خێزان لەبازنەیەکدا بەردەوام بخولێتەوە، کە ڕەنگە منداڵەکەی زۆر بەکەمی گۆڕانکاریی بەسەردا بێت.

ئەم خشتەیە کۆمەڵێک لایەن دەگرێتەوە، کەوا منداڵی ئۆتیزم ڕەنگە کێشەی تێدا هەبێت و لەڕێگەی ئەو هەڵسەنگاندنەوە دەتوانرێت بەرنامە بۆ منداڵەکە دابنرێت، ئەم هەڵسەنگاندنە دەتوانرێت ماوەی جارێک ئەنجام بدرێت، بۆ نموونە هەموو مانگێک یان دوو مانگ جارێک، ئەمەش لەسەر پێشکەوتن و بەرەوپێشچوونی منداڵەکە دەوەستێت.

# هەڵسەنگاندی منداڵی ئۆتیزم

بێگومان منداڵی ئۆتیزم لەهەندێ لایەن و تواناکاندا زۆر بەهێزن و توانایەکی جیاوازیان هەیە بەبەراورد بەکەسانی تر، ڕەنگە زۆر جار ئەمەش ببێتە کێشە بۆیان، لەهەمان کاتدا لەبەرامبەر ئەو توانایە لاوازییەکی زۆریان لەهەندێ لایەنی تر هەیە، ڕەنگە لاوازییان لەهەندێ توانای زۆر سادەدا هەبێت، بەتایبەت توانای گرنگیدان بەخۆیان لەژیانی ڕۆژانەدا، کە ئەمەش دیسانەوە کێشەیان بۆ دروست دەکات، چی لەناو خێزاندا، چی لەناو کۆمەڵگەو شوێنە گشتییەکاندا.

پێویستە هەموو خێزانێك لەکاتی ڕاهێنانی منداڵەکەی لیستێکی هەبێت، کە ماوەی جارێك هەڵسەنگاندن بۆ منداڵەکەی بکات، بەڵام ئەوەی گرنگە لەو لیستە دەربکەوێت، منداڵەکە لەهەندێ لایەن هیچ کێشەی نییەو توانایەکی باشی هەیە، لەبەرامبەردا وەك باسمان کردن لەهەندێ لایەندا زۆر لاوازەو کێشەی زۆری هەیە، دەبێت خێزان لەو کاتدا گرنگییەکی باش بەلایەنە لاوازەکە بدات، ئەوەش بەبەکارهێنانی هەموو ئەو کەرەستانەی دەبنە هۆی بەهێزکردنی ئەو لایەنانە، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت، بەهیچ شێوەیەك لایەنە بەهێزەکە پشتگوێ

بخرێت، چونکە ئەگەر ئەو لایەنە بەهێزانە پشتگوێ بخرێت، چونکە ڕەنگە لە لایەنە بە هێزەکان هێواش هێواش بەرەو دواوە بڕوات „ ئەمەش وا دەکات خێزان کاتێکی تر خەمی ئەو لایەنانە بخورێتو گرنگی پێ بدات کە پێشتر منداڵ تێیدا هیچ کێشەی نەبوو، بەم شێوەیە دەبێت خێزان لەبازنەیەکدا بەردەوام بخولێتەوە، کە ڕەنگە منداڵەکەی زۆر بەکەمی گۆڕانکاریی بەسەردا بێت.

زۆر جۆری هەڵسەنگاندن هەیە کە خێزان دەتوانێت پشتی پێ ببەستێت بۆ هەڵسەنگاندنی منداڵەکەی ,هەندێ هەڵسەنگاندن هەیە وەك) پێپ ئار (PEP -کە خێزان خۆی دەتوانێت ئەو هەڵسەنگاندنە لە ماڵ ئەنجام بدات ,بەڵام هەندێ جۆری تر هەیە وەك پێوەری دەرونی پەروەردەیی) پێی سری (Psychoeducational Profile-Third Edition - PEP-٣کە پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە ,لەم بەرنامەی هەڵسەنگاندنە خێزان و کەسێکی پسپۆر و ڕاهێنەری منداڵەکە و منداڵەکە ئامادە دەبن ,زۆر پرسیار هەیە لەم جۆرە هەڵسەنگاندنە تەنها خێزان دەتوانێت وڵامی بداتەوە ,لە هەمان کاتدا هەندێ پرسیار هەیە ڕەنگە ڕاهێنەرەکە بتوانێت وڵامی بداتەوە ,بەڵام هەندێ بڕگەی هەیە پێویستی بە منداڵەکەیە کە دەبێت ئەنجامی بدات

تا توانا و هەڵسوکەوتی باش و لاوازی دەستنیشان بکرێت ,ئەم بەرنامەیە بۆ منداڵانی تەمەنی دوو ساڵ بۆ حەوت ساڵ و شەش مانگ ( ٧:٦ - ٢ ) ئەنجام دەدرێت ,لەم پێوەرە زۆر لایەن هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت ,وەك) پەیوەندی زارەکی و نازارەکی , درك کردنی ,توانای گشتی ,ماسولکەی بچووك و گەورە , رەفتار...زۆر لایەنی تر (لە ئەنجامی ئەم بەرنامەیە بەرنامەیەکی تۆکمە بۆ منداڵەکە دادەنرێت.

) فیلاند Vineland Adaptive Behavior Scale) -پێوەری فیلاند تایبەتە بە رەفتاری گونجاندنی) کۆمەڵایەتی ,(لەم پێوەرە زۆر لایەن هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت ,وەك) پەیوەندی کۆمەڵایەتی ,گرنگیدان بە خود ,خواردن ,گەشەی کۆمەڵایەتی , توانای جوڵە و زۆر لایەنی گرنگ کە پەیوەندی بە ژیانی رۆژانەی منداڵەکەوە هەیە ,(لەم جۆرە هەڵسەنگاندنە دەبێت کەسانی پسپۆڕ و شارەزا ئەنجامی بدەن ,چونکە پێویستی بە کاتێکی زۆر و ئەزموونێکی باش هەیە ,ئەمە تەنها بە بەیەك رۆژ و بە یەك دانیشتن ئەنجام نادرێت ,ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنانە پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە و پێویستە ئەو پسپۆڕە مامەڵەی تەواوی لە گەڵ ئەو منداڵە کردبێت تا بتوانێت وڵامی هەموو پرسیارەکان بداتەوە ,ئیتر ئەو پسپۆڕە خێزان

بێت یان ڕاهێنەر یان هەر کەسێکی تر کە مامەڵەی لە گەڵ منداڵەکە کردبێت ,دیسانەوە بە پێی ئەم پێوەرە بەرنامە بۆ منداڵ دادەنرێت و پلانێکی بۆ سێ تا شەش مانگ دادەنرێت و کار لە سەر ئەو پلان و ئامانجانە دەکرێت .

# دروست کردنی پەیوەندی

یەکێك لە کێشە گەورەکانی منداڵی ئۆتیزم نەبوونی پەیوەندیە لە گەڵ دەوربەردا. واتا لە گەڵ ئەو کەسانەی چاودێری دەکەن و ڕاهێنانی بۆ دەکەن. پەیوەندیش بە بنەمایی کاری ڕاهێنان و بەرەوپێشوون دادەنرێت. بە نەبوونی پەیوەندی پێشکەوتن زۆر لاواز دەبێت. بۆیە بوونی پەیوەندی مەرجی هەموو چالاکییەکە، لە هەمان کاتدا کاری یەکەم لە ڕاهێناندا لە گەڵ منداڵی ئۆتیزم بریتییە لە دروست کردنی ئەو پەیوەندییە، بێگومان پەیوەندیش پێویستی کات و شوێنی گونجاو هەیە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە دروست کردنی پەیوەندی پێویستی بە کات هەیە و بە پێی ڕێژەی ئۆتیزمی منداڵەکە دەگۆڕێت. بۆیە نابێت خێزان و پشپۆران و ڕاهێنەران لە دروست کردنی پەیوەندی بێهیوا بن.

ئایە ئەو پەیوەندییە چۆن دروست دەبێت؟

سەرەتا بۆ دروست کردنی پەیوەندی لە گەڵ منداڵی ئۆتیزمدا پێویستم بە پاڵنەر هەیە، واتا بۆ ئەوەی منداڵەکە رابکێشین بۆ لای خۆمان تا پەیوەندیمان لە گەڵ دروست بکات پێویستە بەو شتە دەست پێ بکەین کە لای منداڵەکە خۆشەویست و گرنگە. بۆ نموونە خواردن یان یارییەکی دیاری کراو یان هەر شتێك کە

منداڵەکە حەزی لێیە و بەردەوام پێیەتی و بۆ هەر جێگایەك بڕوات لە گەڵ خۆی دەیبات. واتا دەبێت هۆکارێك هەبێت بۆ ئەوەی منداڵی ئۆتیزم ناچار بێت پەیوەندی دروست بکات، بۆنموونە دەتوانرێت ئەو شتەی داوای دەکات یان حەزی لێیەتی لێی بشارێتەوە، بۆ ئەوەی پەیوەندی دروست بکات و هەوڵ بدات بکاتە ئەو شتە.

پێویستە منداڵەکە بە ناوی خۆی بانگ بکرێت، بۆ ئەوەی بزانێت مەبەستت ئەوە نەك کەسێکی تر.

دەبێت ئەو جێگایەی کار لە گەڵ منداڵەکە دەکەی شوێنێکی سادە و ئاسایی بێت و دوربێت لەو شتە هەستیاریانەی منداڵەکە رادەکێشێت، ئەمەش هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە کار دەکاتە سەر هەر پێنج هەستەکە ( بینین، بیستن، تام کردن، بۆن کرد، دەست لێدان )، واتا هەموو ئەو شتانەی کە ڕەنگە کاریگەری هەبێت لە سەر ئەم هەستانە دەبێت لەو ژورە یان ئەو جێگایە نەبێت کە تێیدا هەوڵ دەدرێت پەیوەندی لە گەڵ منداڵی ئۆتیزم دروست بکرێت، وەك ( تەلەفیزیۆن، یان گڵۆپی ڕەنگاو ڕەنگ، دەنگی بەرز ... تا دوای )

دەبێت ووشەی زۆر ئاسان و سادە بە کار بهێنرێت، واتا دەبێت ئەو شتەی دەتەوێ ئەو شتە بڵێیت نەك هەندێ ووشە کە چەند

مانایەکی هەیە,هەوڵ بدە وێنە بە کار بێنە, چونکە منداڵی ئۆتیزم چاوی ( واتا بینینی ) بە هێزە.

منداڵی ئۆتیزم کاتێکی زۆری دەوێت بۆ تێگەیشتن لە ووشەو ئەو شتانەی پێی دەوترێت و داوای لێ دەکرێت, بۆیە پێویستە کاتێکی تەواویان پێ بدرێت بۆ تێگەیشتن.

پێویستە یەك فەرمان بە منداڵی ئۆتیزم بکات, یەك کەس فەرمان یان داواکاری لێ بکات.

# ئۆتیزم و ژینگەی دەرەوە

منـداڵی ئـۆتیزم وەك منـداڵی ئاسـایی پێویـستی بەژینگـەی دەرەوە هەیـە، ڕەنگـە زیـاترش پێویـستی بەدەرچـوون و گـەڕان ببێت، ئەمەش کاریگەریی باشی لەسەر منداڵەکە دەبێت، دەبێت ئـەوەمان لەبەرچـاو بێـت، کـە ڕەنگـە سـەرەتا بەهەنـدێ جێگـا ڕانەیەت و هەڵبچێت و هەندێ ڕەفتاری نادروستی هـەبێت، بـەڵام دەبێـت دڵنیـابین کـە بەئاسـانی لەسـەر ئـەو جێگانـە ڕادێـت و لەداهاتوو زیـاتر پێـی خـۆش دەبێـت کـە دەچێتە ئـەو جێگایـە، ئەوەی گرنگە لەو دەرچوونانە ڕەچاو بکرێت، ئەوەیە کە دەبێت ئـەو دەرچـوونانە بـەپلان بێـت، ئەگـەر وێنـەی ئـەو جێگایـە هـەبێت و پێـشوەخت بەوێنـە بـۆ منداڵەکـە ڕوونبکرێتـەوە، کـە دەڕوات بۆ ئەو جێگایە، ڕەنگە لەدڵەڕاوکێ و هەڵچوونی کـەمتر بکاتـەوە، بێگومـان ڕۆشـتنی لـەناکاو و بـێ بەرنامـە بـۆ هـەر جێگایەك بۆ منداڵی ئۆتیزم قورسە.

ژینگـــەی دەرەوە مەبەســـتمان لـــەبازاڕو باخـــچەکان و شوێنەگـشتییەکان و یـاری منداڵانـە، ئـەم جێگانـە بـۆ منـداڵی ئۆتیزم گرنگی هەیە، جگە لەتێکەڵبوونی منداڵ بەهاوتەمەنی خۆی، گرنگی تری زۆرە وەك ناسینی ئـەو شوێنانە و یاریکردن و

بەتاڵبوونەوە، چونکە منداڵی ئۆتیزم وزەیەکی زۆری تێدایەو پێویستە ڕۆژانە ئەو وزەیە خەرج بکات, پاشان لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە دەبێت منداڵی ئۆتیزم وەك کەسێکی ئاسایی تەماشا بکرێت, تەنها ئەوە نەبێت کە هەندێ جیاوازی هەیە, بەم شێوەیە لە کۆمەڵگە دانابڕێت, بێگومان ئەو منداڵانەی ڕێژەی ئۆتیزمەکەیان زۆر توندە زیاتر پێویستیان بەوە هەیە بە بەرنامە ببرێنە ئەو جێگانە.

بردنە دەرەوەی منداڵ بۆ دەرەوەی خێزان و تێکەڵ کردنیان بە ژینگەی دەرەوە زۆر مەبەست و ئامانج دەگرێتەوە, گرنگترینیان ئەوەیە کە تێکەڵ بە کۆمەڵگە دەکرێنەوە, هەرچەندە ئەم لایەنە کاری زۆر دەوێت, پاشان مەبەستێکی گرنگتر ئەوەیە کەوا دەبێت هەوڵ بدرێت منداڵی ئۆتیزم لە داهاتوو بتوانێت تاڕادەیەك پشت بە خۆی ببەستێت لە بەدەست هێنانی هەندێ پێداویستی ڕۆژانەی خۆی, ئەم کارە هەرچەندە قورس بێت, بەڵام لە کۆتاییدا ئەنجامی دەبێت.

ئەوەی گرنگە کە خێزان بیزانێت دەبێت هەموو ئەو دەرچوون و بردنە دەرەوەی منداڵی ئۆتیزم بە بەرنامە و پلان بێت, نابێت بە حەزو ئارەزووە منداڵەکە بێت, چونکە ئەوان یان بڵێین زۆربەیان تەواو بوون و تێر بوون و کاتێکی تر یان

سبەێنی تێناگەن، کە داوای کرد لە هەمان کاتدا دەیەوێت، بەڵام دەکرێت ئەم بەرنامە و بردنە دەرەوەی منداڵ وەك پاداشتێك لە گەڵیدا بە کاربێت، واتا پاداشت کردنی رەفتاری باش، لە هەمان کاتدا ئەگەر لە بەرنامەدا هەبوو ببرێتە دەرەوە و رەفتارێکی ناشیاوی نوواند، دەکرێت ئەو بەرنامەیە هەڵبووەشێتەوەو نەبرێت بۆ ئەو جێگایە و بۆی روونبکرێتەوە لە بەر ئەوەی ئەو رەفتارە ناشیاوەت ئەنجامدا بۆیە ئەمرۆ ناڕۆیت بۆ باخچە یان بازار یاخود ماڵی فلان، بەم شێوەیە منداڵ فێری پاداشت و سزا دەبێت و سوودی دەبێت لە رێکخستنی رەفتارەکانی.

# ئۆتیزم و وێنە

منداڵی ئۆتیزم ناتوانێت زنجیرە بۆ ڕووداوەکانی ڕۆژ دابنێت، واتا نازانێت پاش کەمێکی تر چی ڕوودەدات، یان نازانێت چی ئەرکێکی لەسەرەو کەی دەست پێدەکاتو لەکوێ کۆتایی دێت، پەیوەندی شتەکان بە یەکەوە لە جێگایەکدا نازانێت، بۆیە بەردەوام هەست بە دڵەراوکێ و ترس دەکات، بۆیە دەبێت بەردەوام ژینگەیەکی ڕێکخراو بۆ منداڵی ئۆتیزم هەبێت، لێرەوە گرنگی بەرنامەکان دەردەکەوێت، بۆیە پێویستە بەرنامەی تایبەت بۆ ئەو منداڵانە دابنرێت، تا بتوانێت زنجیرە بۆ کارو چالاکی ڕۆژانەی دابنێت.

زۆر جار ڕۆتین لای منداڵی ئۆتیزم دەبێتە کێشە بۆ خێزانەکە، بەڵام لەهەندێ حاڵەتدا خێزان ناچار دەبێت، خۆی ڕۆتین بۆ منداڵەکە دروست بکات، ئەو ڕۆتینەی بەپێی بەرنامە دروستدەکرێت کێشەی نییە، بەڵام دەبێت خێزانیش خۆی پابەندبێت بەو ڕۆتینەوە، ئەگینا منداڵ تووشی بێزاریو هەڵچوونو دڵەڕاوکێ دەبێت.

دەکرێت بەڕۆتین زنجیرەی ڕووداوەکانی ڕۆژو هەفتە بۆ منداڵی ئۆتیزم دروست بکرێت، واتا هەر لەبەیانی کە لەخەو

هەڵدەستێت، تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە ناو جێگاو دەخەوێت، ئەمەش بەدانانی بەرنامەی ڕۆژانە دەکرێت، پاشان ئەو کارانەی یان ئەو چالاکییانەی پێویستە لەسەری ئەنجامی بداتو کەی دەست پێ بکاتو هەنگاوی دوای ئەو چالاکییە چییەو کەی دەبێت بوەستێتو کەی دەست بکات بەچالاکییەکی تر، ماوەی هەموو چالاکییەك چەند دەبێت، لەکوێ ئەو چالاکییە ئەنجام دەدات لەگەڵ کێ ئەنجامی دەدات، هەموو ئەم هەنگاوانە دەکرێت بەوێنەو هێماو بەرنامەو ڕێکخستنی ڕووبەری ئەو شوێنەی چالاکییەکەی تێدا ئەنجام دەداتو کاتی دەستپێکردنو کاتی کۆتایی هاتنی چالاکیەکانو ...هتد بۆ منداڵی ئۆتیزم ڕوون بکرێتەوە، ئەمە چالاکیو ئەرکەکانی بۆ ئاسان دەکات، بەڵام دروستکردنی ئەم ڕۆتینە تۆزێك بۆ خێزان زەحمەتو دەبێت ماوەیەك زۆر خۆیان ماندوو بکەن، تا ئەو ڕۆتینە دروست دەبێت، دوای ئەو ڕۆتینە هەموو شتێك بەئاسایی دەڕواتو منداڵی ئۆتیزم کێشەی کەمتر دەبێت، یان دەتوانین بڵێین ئەگەر هاتوو ژینگەیەکی بۆ ڕێکخرا، ئەوە دەبێت چاوەڕێی بەرەو پێشچوون بکرێت، چونکە منداڵی ئۆتیزم لەژینگەی ڕێکخراودا (منظم) زۆر بەباشی بەرەوپێش دەچێت.

وێنـەو هێمـا زۆر شـت بـۆ منـداڵی ئـۆتیزم ئاسـان دەكـات، بەتایبـەت ئـەو منداڵانـەی قسـەناكەن، بۆیـە پێویسـتە بـەردەوام وێنەی ئەو كەسانەی ڕۆژانە مامەڵەی لەگەڵ دەكەنن لەبەرچاو بێت، دەكرێت وێنە بۆ زۆر شتی تـر لەگـەڵ بـەكاربێت، تەنانـەت بۆ ڕاهێنانی لەسەر قسەكردن، چونكە منـداڵی ئـۆتیزم وێنـەی لا ئاسانترە تا وشە.

بەڵام كاتێك منداڵی ئۆتیزم بەتەواوەتی ڕاهاتو تواناپـەكی باشی لەچالاكییەكانی ڕۆژانـەدا هـەبوو و توانـای ئـەوەی هـەبوو زنجیرە بـۆ ڕووداوەكـانی ڕۆژ دابنێـت، پێویسـتە لێـرەدا هێـواش هێـواش كـار بـۆ ئـەوە بكرێـت، ڕۆتـینی كـەم بكرێتـەوە، چـونكە بەردەوامبوون لەسەر ڕۆتین بەتایبەت كە توانای باش بێتن زۆر كێشەو گرفتی بـۆ دروسـتدەكات، هـەر وەك چـۆن دروسـتكردنی ڕۆتین كاتو هەوڵی دەوێـت، بەهـەمان شێوەش شـكاندنی ڕۆتـین كـاتو هـەوڵی دەوێـت، بـەڵام لەهـەردوو حاڵەتەكـەدا دەبێـت دڵنیابین هیچ شتێك ئەستەم نییە.

# ئۆتیزم و قوتابخانە

زۆر جار منداڵی ئۆتیزم دوای ڕاهێنانێکی باش دەتوانێت قسەبکات، بێگومان ئەمەش بەهاوکاریی خێزان‌و کەسانی پسپۆڕ، ئەگەر منداڵی ئۆتیزم دوای تەمەنی قوتابخانەش قسەی کرد، ئەوە پێویستە بچێتە قوتابخانە، مەبەستمان لەقوتابخانەی ئاساییەو لەسیستەمی پەروەردەی تایبەت، بەڵام ئەگەر لەجێگایەك یان شارێك بوو، لەو جێگایە مامۆستای پەروەردەی تایبەتیش نەبوو، ئەوە هەر پێویستە ئەو منداڵە بچێتە بەر خوێندن، پێویستە خێزان لەم ڕووەوە سوور بێت‌و بەقسەی هیچ کەس پەشیمان نەبێتەوە، بێگومان کەسانێك دەڵێن سوودی نییەو فێری هیچ نابێت، بەڵام چوونە خوێندن‌و ئامانجی قوتابخانە تەنها فێربوونی پیت‌و ژمارە نییە، منداڵی ئۆتیزم کێشەی تێکەڵبوونی هەیە، هەر کەسێك تێکەڵ بەکۆمەڵگە نەبێت، ئەوە بەرەو پێش ناچێت، نەك تەنها لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، بەڵکو لەڕووی زمان‌و پەروەردەو زۆر شتی ترەوە، چوونە بەر خوێندنی منداڵی ئۆتیزم زۆر سوودی هەیە، هیچ نەبێت، فێری کۆمەڵێك سستەمی کۆمەڵایەتی‌و وەستان

لەڕیزو دانیشتن لەپۆلو ... هتد دەبێت، کە ئەمە زۆر گرنگە بۆ منداڵی ئۆتیزم.

ژینگەی قوتابخانە بۆ منداڵی ئۆتیزم گرنگی تایبەتی هەیە، بەڵام بێگومان زۆر جار لەو ژینگەیە هەڵناکاتو بێزاردەبێتو ڕەنگە بەهۆی هەندێ دەنگدەرکردنەوە ببێتە هۆی تێکچوونی کەشوهەوای پۆلەکە، یان ڕەنگە خۆی بەو ژینگەیە هەڵنەکاتو ئازاری هاوپۆلەکانی بدات، کێشەکانی منداڵی ئۆتیزم لەقوتابخانە یان لەپۆلدا زۆرن، بەڵام گرنگترینیان ئەوەیە، کە ئەوان ناتوانن لەسەرەتاو کۆتایی چالاکییەکان تێبگەن، یان لەچالاکییەکەوە بچن بۆ چالاکییەکی تر، وشەکان بۆ ئەوان قورسنو مانای زیاتر لەماناکانی خۆیان هەیە، کات لای ئەوان مانای نییە، واتا ڕەنگە نەتوانێت چاوەڕوانی ئەوە بێت، کە هەموو وانەیەك کاتی دیاریکراوی خۆی هەیەو دەبێت ئەو کاتە کۆتایی بێت، ئینجا دەتوانێت بڕواتە دەرەوە، فێربوونی لەسەر وێنە پێ باشترو خۆشترە، تا نووسینو وشە، ئەمەو چەندین کێشەی تر، کە ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی منداڵی ئۆتیزم نەتوانێت لەقوتابخانە بەردەوام بێت، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو کێشانە چارەسەرکرا، ئەوە زۆر بەئاسانی فێردەبێتو توانای دانیشتنی باش دەبێتو ڕەنگە بەئاسانیش قۆناغەکان ببڕێت، بۆیە پێویستە لەناو

قوتابخانـه کەسـانی پسپۆر یـان هـیچ نـەبێت، کەسـانێك لەگـەڵ منـداڵی ئـۆتیزم دابنرێـت، کـه خـولی بینیبێـتو شـارەزایی لەچـۆنێتی مامەڵـەکردن لەگـەڵ منـداڵی ئۆتیزمـدا هـەبێتو بەرنامـەی تایبـەتی بـۆ دابنرێـت، بـۆ نموونـه دروسـتکردنی رۆتینێکی رۆژانـه بـۆ وانـەکانو چوونه پۆلو جێگای تایبەتی خۆی، پاشان لەکاتی دەرکردنی هەندێ دەنـگ، کە ڕەنگه ببێتـه هـۆی تێکـچوونی کەشـوهەوای پـۆل دەکرێـت، هەنـدێ کـارتی ڕەنگاوڕەنگ دروست بکرێت، کە لەو کاتانـه نیشانی بـدرێت، بـۆ نموونــه کــارتێکی ســوورو لەســەری نووســرابێت، بەســه یــان نووسـرابێت، ئـەو ڕەفتـاره قبـول نییـه، منـداڵی ئـۆتیزم لەشتی بینـراو زیـاتر سـوود دەبینـنو فێـردەبن، بۆیـه واباشـتره، شـته بەکارهاتووەکان لەپۆلدا بینراو بنو بەشێوەی وێنه بۆ منداڵەکه بـەکاربێت، دەبێـت ڕوونکردنـەوەی وانـەکان بـۆ منـداڵی ئـۆتیزم کورتو پوخت بێت، نابێت وشەی قورس بـەکاربهێنرێت، نابێـت پرسـیاری درێـژ لەمنـداڵی ئـۆتیزم بکرێـت، ئەگـەر هـاتوو ئـەو شتانەو شتی تـر، کـه بەپێویـست بزانرێـت بـۆ منـداڵی ئۆتیزم دەستەبەر بکرێـت، بێگومـان منداڵەکـه بـەهێمنیو بـەبێ هـیچ کێشەیەك وانـەکانی ڕۆژانـەی دەباتـه سـەر، بـەڵام ئەمـه ئـەوه ناگەیەنێت، کەوا ئیتر ئەو منداڵه منداڵێکی ئاسایی دەبێتو هیچ

کێشەی نابێت، بۆیە دەبێت چاوەڕوانی ئەوە بکرێت، جارێکی تر هەمان ڕەفتار دووبارە بکاتەوە.

بەشێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین دەبێت ئەو قوتابخانەیە، کە منداڵی ئۆتیزمی تێدا دەبێت، قوتابخانەیەکی ئاسایی نەبێتو ئامادەکراو بێت، دەبێت ئەو مامۆستایە بۆ ئەو منداڵە دابنرێت، شارەزای باشی لەسەر ئۆتیزم هەبێتو خولی تایبەتی بینیبێت، بەم شێوەیە دەتوانرێت لەگەڵ تێکەڵکردنو بەرەو پێشچوونی توانا کۆمەڵایەتییەکان خزمەتی لایەنی تواناکانو فێرکردنو بەرەو پێشچوونیش بکرێت.

# پلان و بەرنامە

یەکێك لەشتە هەرە گرنگەکان بۆ منداڵی ئۆتیزم بوونی پلانو بەرنامەیە، ئەگەر هاتوو خێزان توانی بەپلانو بەرنامە لەگەڵ منداڵەکەی بجووڵێتەوە، ئەوە دڵنیابێت منداڵەکەی زۆر بێ کێشە دەبێت و زۆر بە باشی کار و چالاکی و ئەرکەکانی جێبەجێ دەکات و بەرەو پێش دەڕوات، ئەوەش لە سەر ئاست و توانای منداڵەکە لە لایەك و، پابەندبوونی خێزان بەو بەرنامەوە لە لایەکی ترەوە دەوەستێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئیتر ئەو منداڵە پێویستی بە هاوکاری نابێت و بێ کێشە دەبێت، چونکە منداڵی ئۆتیزم کێشەی زۆرەو بەردەوام کێشەی نوێ سەرهەڵدەدات کە چاوەڕوان نەکراو بووە.

مەبەستمان لەپلانو بەرنامە چییە؟ بێگومان ناتوانرێت لەکۆمەڵگەی ئێمەدا هەموو شت بەپلانو بەرنامە بەڕێوەبچێت، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین شتی لەناکاو و بێ بەرنامە منداڵی ئۆتیزم تووشی شڵەژانو دڵەڕاوکێ دەکات، جاری وا هەیە کە میوانێکی بێ بەرنامەی پێشوەخت دەڕوات بۆ ماڵێك کە منداڵی ئۆتیزمیان هەیە، ئەمە بۆ ئەو منداڵە قورسە بۆیە تێکدەچێتو هەندێ ڕەفتاری سەیر دەکات کە بەلای خێزانەوە نامۆیە، یان

بەهیچ شێوەیەك ناڕوات بەلای میوانەکەوە، هەر چەندە میوانەکە بیەوێت گرنگی پێبدات، لەهەمان کاتدا ڕۆشتن بۆ ماڵی ناسیاو و دۆست و خزم لەلایەن خێزانی ئۆتیزمەوە، دەبێت بە بەرنامەو پلان بێت، ئەگینا بۆ منداڵی ئۆتیزم کارێکی قورس دەبێت، ڕەنگە نەیەتە ژوورەوە، یان ئەگەر هاتە ژوورەوە، ڕەنگە هەندێ ڕەفتارو هەڵسوکەوت بکات، کە خێزان پێی شەرمەزار دەبێت، واتا نەك تەنها بۆ ماڵان منداڵی ئۆتیزم پێویستی بەبەرنامەی پێشوەخت هەیە، بەڵکو تەنانەت بۆ ئەو شوێنانەی کە خۆی حەز دەکات بۆی بڕوات، پێویستە بەرنامە هەبێت و پێشر بە وێنە ئاگاداربکرێتەوە, چونکە منداڵی ئۆتیزم ناتوانێت وەك کەسێك ئاسایی بزانێت داهاتوو چی دەبێت یان چی ڕوو دەدات، بۆیە پێویستە هەموو دەرچوون‌و هاتنی میوان‌و ...هتد بەبەرنامەو پلان بێت، لەم حاڵەتەدا دەبێت خێزان دڵنیا بێت، کە منداڵەکەی بەئاسانی فێری ئەو پلان‌و بەرنامانە دەبێت‌و لەسەری ڕادێت.

ئەو منداڵانەی کە قسە دەکەن و لە قسە کردن تێدەگەن دەکرێت بە ووتن چەند جارێك پێش ڕۆشتن بۆ هەر جێگایەك ئاگادار بکرێتەوە, ئەگەر منداڵێك لە تواناییدا هەبوو بنووسێت و بخوێنێتەوە, ئەوە باشترە بە نووسین بۆی بنووسرێت و داوای

لێبکرێت خۆی بیخوێنێتەوە, یان داوا لە خۆی بکرێت بۆ نموونە بتووسێت ( سبەینێ دەڕۆین بۆ .... ).

لە پلان و بەرنامەدا پێنج پرسیاری زۆر گرنگ هەیە کە دەکرێت وڵامەکانی ئامادە بێت بۆ منداڵی ئۆتیزم, ئەو پێنج پرسیارەش بریتیە لە ( چی, چۆن, کەی, لە کوێ, کێ ), بۆنموونە چی: واتا ئەنجامدانی کارێك یان چالاکییەك ( نان خواردنی نیوەڕۆ- بۆ نموونە) چۆن: بە دانیشتن لە سەر مێز و کورسی, کەی: سەعات ( ١٢ ) نیوەڕۆ, لە کوێ: لە مەتبەخ, کێ: تۆو دایەو بابە, بەم شێوەیە کارێکت بۆ منداڵەکە ئاسان کرد, ئەمەش بە دیاری کردنی کات و شوێن, دەتوانرێت ئەم پێنج پرسیارە بۆ هەموو مەبەستێك بە کار بهێنرێت, تەنانەت بۆ ڕۆشتن بۆ جێگایەك یان بۆ ماڵی کەسێك یان خزمێك, ئەمە دڵەڕوکێ و شڵەژان لای منداڵ کەم دەکاتەوە, بەڵام کێشەکان و ڕەفتارە نەگونجاوەکان بنبڕ ناکات, بێگومان کەمیان دەکاتەوە.

هەر لە بەرنامەو پلاندا دەبێت ئامانجەکان دیاری کراو بێت لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییەکان, واتا دەبێت بە پێی کێشەو گرفتەکانی منداڵەکە بەرنامەو پرۆگرام دابنرێت, دەبێت ئەو ئامانجانە دیاری بکرێت کە دەکرێت کاری لە سەر بکرێت, واتا دەبێت ئامانجەکان ئامانج ڕوون و ئاشکرا بن کە لە توانادا

هەبێت جێبەجێ بکرێت، واتا ئامانجی خەیاڵی نەبێت، دەبێت ئەو ئامانجانە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو دابنرێت، بۆ نموونە بۆ ماوەی سێ تا شەش مانگ چەند ئامانجێك دادەنرێت و کاری لە سەر دەکرێت، دوای ئەو ماوەیە دەبێت پێداچوونەوە بۆ ئامانجەکان بکرێت تا بزانرێت چەند لەو ئامانجانە جێبەجێ کراوە و هاتووەتە دی، ئەگەر دەرکەوت زۆربەیان نەهاتوونەتە دی دەبێت ئەوە بزانین کە کێشەمان هەیە لە دانانی ئامانجەکان، ئەگەر زۆربەی هاتبووە دی ئەوە دەتوانین کار بۆ ئامانی تر بکەین.

بۆ هەموو پلان و بەرنامەو دیاری کردنی ئامانج پێویستە هەڵسەنگاندن هەبێت، بۆ هەڵسەنگاندیش زۆر بەرنامە هەیە کە بۆ منداڵی ئۆتیزم بە کار دێت، ئەو بەرنامانەش هەموو لایەنەکانی منداڵەکە دەردەخات، بە پێی ئەو هەڵسەنگاندنە دەتوانرێت ئامانج و پلان و بەرنامە دابنرێت.

لە ئامانج داناندا وەك ئامازەمان پێدا نابێت خەیاڵی بێن، دەبێت ئەو ئامانجانەی دادەنرێت بەراستی لە تواناندا هەبێت کاری لە سەر بکرێت، دەبێت ئامانجەکانش پۆلێن کراو بێت، ناکرێت ئامانجێك دابنرێت بۆ ئەوەی لە ماوەی سێ یان شەش مانگ منداڵ فێری قسەکردن بکرێت، لە کاتێکدا منداڵەکە

هێشتا لە توانایدا نیە دابنشێت، یان لە توانایدا نیە گرنگی بە خۆی بدات و لە توانا سەرەتاییەکانی ڕۆژانەی کێشەی هەیە، ئەمە و چەندین کێشەی تر کە دەبێت لە سەرەتای ئامانجەکان دابنرێت و کاری لە سەر بکرێت، پاشان و دوای سەرکەوتن و هاتنە دی ئامانجەکان دەگرێت ئامانجی تر دابنرێت و کاری لە سەر بکرێت.

# ئۆتیزم و یاری کردن

یاری کردن و دیاری کردنی کاتێك بۆ یاری کردن بۆ منداڵ بە گشتی کاریگەر خۆی هەیە، بەڵام بۆ منداڵی ئۆتیزم گرنگیەکی تایبەتی هەیە، بۆیە دەبێت ئەو لایەنە فەرامۆش نەکرێت و گرنگی تەواوی پێبدرێت، بەڵام ئایە چ جۆرە یارییەك بۆ منداڵی ئۆتیزم گرنگە، ئایە کاتی ئەنجامدانی ئەو یاریانە کەی ببێت و کێ لە گەڵیدا ئەنجامی بدات؟

منداڵی ئۆتیزم کێشەی زۆرە، یەکێك لەو کێشانە ناتوانێت خۆی یارییەکانی هەڵبژێرێت و یاری پێ بکات، ئەگەر یارییەکەشی هەڵبژارد ئەوە ڕەنگە نەتوانێت وەك خۆی یاری پێ بکات، یان بڵێین ناتوانێت وەك منداڵێکی ئاسایی یاری پێ بکات و خەیاڵ بەکار بێنێت لە یارییەکاندا، یان ڕەنگە ئەگەر وازی لێبێنیت کاتێکی زۆر بەو یارییەوە بە سەر بەرێت، ئەمەش بەراستی پێویستی بە هاوکاری بەردەوام هەیە، بۆ ئەوە ئەو یارییە بە شێوەیەکی دروست بە کاربێنێت.

یارییەکان دەبێت یاری مەبەستدار بێت، واتا لە هەموو یارییەکدا دەبێت کۆمەڵێك یان ئامانجێك بپێکین، چونکە ڕەنگە لە ڕێگەی ئەو یاریانەوە منداڵی ئۆتیزم فێری کۆمەڵێك

ڕەفتاری دروست ببێت، دەتوانین فێری بکەین چۆن چاوەڕوانی ڕۆڵی خۆی بێت، کەی ڕۆڵی تەواو دەبێت، فێری خەیاڵ ببێت لە یاری کردندا، یان چۆن لە یارییەکەوە بڕوات بۆ یارییەکی تر، ئەمە و چەندین ئامانجی تر کە دەکرێت لە یارییەکدا بیپێکین، بێگومان ئەنجامدانی یارییەکی لەم جۆرە پێویستی بە دروست کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی هەیە کە منداڵی ئۆتیزم نیەتی یان بەلاوازی ئەو پەیوەندییەی هەیە، لێرەدا زمانی پەیوەندی گەشە دەکات، منداڵی ئۆتیزم لەزەت لە یاری کردن دەبینێت، زۆر کێشەی ڕەفتاری لە ڕێگەی یاری کردنەوە چارەسەر دەکرێت، منداڵ لە یاری کردندا بڕوای بە خۆی دەبێت کاتێک ڕۆڵی پێ دەدرێت.

پێویستە هەموو ئەندامانی خێزان کاتێک دابنێن بۆ یاری کردن لە گەڵ منداڵە ئۆتیزمەکەیان، چونکە هەموو خێزان ڕۆڵی هەیە لە پرۆسەی چارەسەر، پاشان ڕەنگە لە گەڵ هەندێک لە ئەندامانی خێزاندا زۆر بە باشی پەیوەندی دروست بکات و گەشە بکات.

ئەوەی گرنگە لە یاری کردندا ئەوەیە بەردەوام دەبێت ناوی منداڵەکە بووترێت، بۆ ئەوەی یەکەم: ناوی خۆی بزانێت،

دووەم: بۆ ئەوەی بزانێت مەبەستمان ئەوە نەك كەسێكی تر، پاشان ڕۆڵی خۆی دەزانێت.

جۆری یارییەكان بە پێی ئاستی منداڵەكە دەگۆڕێت، دەكرێت هەندێ یاری كۆمەڵایەتی بەكار بهێنرێت، دەكرێت یاری ئاسایی بەكار بهێنرێت، وەك ئۆتۆمبێل، بووكە شووشە، یان هەر یارییەكی تر كە پێویستی بە دانشتن هەبێت، ئەم ئەگەر منداڵەكە جووڵەی زۆر بوو، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو یارییانەوە دانیشتنی كۆنترۆڵ بكرێت، یان دەكرێت لەو یارییانەوە دەست پێبكەین كە خۆی حەزی لێیەتی، ئەمەش بەمەبەستی دروست كردنی پەیوەندی لەگەڵیدا، بەڵام ئەوەی گرنگە نابێت بهێڵین ماوەیەكی زۆر خەریكی ئەو یارییە ببێت، پاشان ئەگەر بە شێوەیەكی هەڵە یاری بەو یارییە دەكرد دەبێت بۆی ڕاست بكەینەوە.

خاڵێكی تر كە زۆر گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێ بدەین، ئەویش بە كارهێنانی منداڵی ئاسایی بۆ یاری كردن لە گەڵ منداڵی ئۆتیزمدا، بۆ ئەوەی منداڵی ئۆتیزم فێری لاسایی كردنەوە كۆپی كردنی منداڵی ئاسایی ببێت، بۆ نموونە كاتێك یارییەك ئەنجام دەدەین لە گەڵ منداڵێكی ئۆتیزم و لەكاتی تەواو بوونی ڕۆڵی خۆی پێی دەڵێین بووەستە، بەڵام ئەو ناوەستێت، دەكرێت

منداڵە ئاساییەکە بهێنین و لە سەر هەمان چالاکی یاری لە گەڵدا بکەین و لەو شوێن و کاتەی بە منداڵە ئۆتیزمەکە ووتمان بووەستە و نەوەستا لێرەدا بە منداڵە ئاساییەکە دەڵێین بووەستە، بێگومان دەوەستێت، ئەم چالاکییە چەند جارێک دووبارەی دەکەینەوە، لە ئەنجامدا دەبینین منداڵە ئۆتیزمەکە بە هەمان شێوە تێگەیشتنی دەبێت بۆ ووشەی بووەستە، ئەم کردارەش لە ژیانی ڕۆژانەی پێویستی پێی دەبێت، بۆیە دەتوانین هەموو ئەو چالاکییانە بە کاری دێنین ئامانجەکەی فێرکردنی توانایەکی گرنگ بێت بۆ منداڵی ئۆتیزم، بەڵام دەبێت لە کاتی یاری و چالاکیی لەم جۆرە لایەنە هەستیارییەکانی منداڵەکە بزانین بۆ ئەوەی تووشی کێشە نەبین لە گەڵیدا.

ئێمە بەردەوام دەبێت ئەوە دووبارە بکەینەوە کە مەرج نیە منداڵی ئۆتیزم بە یەکجار پەیوەندیمان لە گەڵدا دروست بکات و بەشداری یارییەکان بکات، ئەمە لە سەر ئاست و ڕێژەی ئۆتیزمی منداڵەکە دەوەستێت، ڕەنگە ماوەیەکی زۆر بخایەنێت، بۆیە نابێت بێ هیوا ببین و کۆڵ بدەین، چونکە لە ئەنجامدانی چالاکی لەم جۆرە منداڵی ئۆتیزم بە تێپەڕبوونی کات گەشەی

باش دەكات و بەرەوپێش دەروات، ئەوەش گرنگە بیزانین تورە بوون و هەڵچوون ئەنجامەكان دوا دەخات.

# گەشەکردنی توانای ڕۆژانە لەڕێگەی چالاکییەوە

پێویستە بەردەوام منداڵی ئۆتیزم بەئیشێکەوە سەرقاڵ بکرێت، چونکە هەر ئەرك‌و فەرمانێك جێبەجێی بکات، دەبێتە هۆی بەرەو پێشچوونی، لە هەمان کاتدا نەبوونی چالاکی و بوونی بۆشایی دەبێت هۆی دواکەوتن و زیاد بوونی ڕەفتاری دووبارە، بەڵام پێویستە بزانین چۆن ئیشێك یان کارێك بەمنداڵی ئۆتیزم ڕادەسپێرین‌و داوای لێدەکەین جێبەجێی بکات، چونکە منداڵی ئۆتیزم وەك منداڵی ئاسایی لەفەرمانەکان تێناگات، بۆیە زۆر ئاساییە، لەکاتێکدا کارێکی پێ ڕادەسپێردرێت بەباشی‌و وەك خۆی ئەنجام نەدات، بۆ نموونە کۆنترۆڵێکی بدرێتە دەست‌و داوای لێبکرێت بیبات بۆ کەسێك، ڕەنگە کۆنترۆڵەکە فڕێ بدات، یان بیبات بۆ کەسێکی تر، یاخود بیبات بۆ ژوورێکی تر، ئایە چی بکرێت لەم حاڵەتە باشە؟

کاتێك باوك یان دایك یان هەر کەسێکی تر دەیانەوێت ئیشێك بەمنداڵی ئۆتیزم بکەن، ئەوە پێویستە سەرەتا ئەو کەسەی کارەکەی پێ ڕادەسپێرێت (بۆ نموونە ناردنی کۆنترۆڵێك بۆ کەسێك)، ئەوە پێویستە ئەو کەسە بەدەستێکی دەستی

منداڵەکە بگرێت‌و دەستەکەی دیکەی بخاتە پشتی منداڵەکە، تا کۆنترۆڵەکە دەگەیەنێتە کەسی مەبەست، لەم کاتەدا دەبێت کەسی بەرامبەر بێدەنگ بێت، تا کۆنترۆڵەکە دەگاتە دەستی، ئەم پرۆسەیە ڕەنگە چەند ڕۆژێک بخایەنێت، یان چەند هەفتەیەك، بەڵام دەبێت دڵنیابین لەوەی کە قۆناغێك هەیە دوای ئەم قۆناغە کەوا پێویست ناکات دەستی منداڵەکە بگرین‌و تەنها بەداواکردنی‌و فەرمان پێکردنی ئەوە کارەکە جێبەجێ دەکات، لەم کاتەدا پێویستە هەموو پێکەوە دەستخۆشی‌و ئافەرینی لێبکەن‌و چەپڵەی بۆ لێبدەن، کە ئەمە هاندەرێکی باشە، بەڵام ئەگەر هاتوو هەر کەسێك لای خۆیەوە بانگی منداڵەکەی کردو داوای لێکرد کۆنترۆڵەکەی بۆ بیبات، ئەوە منداڵەکە سەری لێ تێکدەچێت و کارەکە وەك خۆی جێبەجێ ناکات، واتا دەبێت یەك کەس فەرمانی پێبکات‌و ئەگەر هەڵەی کرد، ئەوە دەبێت هەر ئەو کەسە هەڵەکەی بۆ ڕاست بکاتەوە. ڕەنگە لە سەرەتای ئەم چالاکییە وا پێویست بکات بە هەموو جەستە هاوکاری منداڵەکە بکرێت، بەڵام دەبێت هێدی هێدی ئەم هاوکارییە کەم بکرێتەوە بۆ ئەوەی منداڵەکە پشت بە خۆی ببەستێت و باوەڕی بە خۆی هەبێت، دەبێت خێزانیش باوەڕیان

پێی هەبێت، ئەم باوەڕ بوونە کاریگەری باشی دەبێت لە ئایندەدا بۆ منداڵەکە.

چالاکییەکی تر کە دەکرێت، لەگەڵ منداڵی ئۆتیزمدا بەکاربێت، ئەوەش لەکاتی ئامادەکردنی خواردنو ڕازاندنەوەی مێز، دەکرێت هەندێ قاپو کەوچكو ئەو شتانەی کە ترسی شکاندنی نییە، بەمنداڵی ئۆتیزم بدرێت، تا بیباتە سەر مێزی نانخواردن، ئەمە جگە لەوەی کە چالاکییەو توانای منداڵی ئۆتیزم زیاددەکات، لەهەمان کاتدا کاریگەریی هەیە کەوا فێری یارمەتی دان ببێت، پاشان لەڕێگەی ئەم چالاکییەوە پەیوەندیی دروست دەکات، ئەگەر لەماوەیەکی دیاریکراودا لەم چالاکییانە سەرکەوتووبوو، ئەوە زۆر بەئاسانی دەتوانێت شتێك بدەیتە دەستو بیبات بۆ کەسێك لەژوورێکی تر، لەم چالاکییە ناوی کەسەکانو ژوورەکان شتی تر فێردەبێت.

بۆ پاکڕاگرتنی خۆیو ئەو شتانەی بەکاری دێنێت، دەتوانرێت ڕاهێنانی لەگەڵ بکرێت، بۆ نموونە کاتێك بە(کلینس) دەمو لوتی پاك دەکەیتەوە، هەر بەخۆی (کلینسەکە) بخە سەتڵی خۆڵەکەوە، بێگومان سەرەتا چەند جارێك پێویست دەکات، دەستی بگریت، بەڵام دواجار دەبینیت، چەند بە

ئاسانیو بێ هاوکاریی کەس خۆی (کلینسەکە) دەخاتە سەتڵی خۆڵەکەوە.

ئەوەی گرنگە خێزان بیزانێت، ئەوەیە کە نابێت لە یەک کاتدا دوو فەرمان بەمنداڵی ئۆتیزم بکرێت، بۆ نموونە داوای لێبکرێت، شتێك ببات بۆ کەسێكو شتێك بێنێت، چونکە ئەوان کێشەیان لەتێگەشتن لەفەرمانەکانو جێبەجێکردنیان هەیە، ئەگەر لەیەك کاتدا دوو فەرمان یان زیاتری پێ بکرێت، بێگومان هیچیان ئەنجام نادات‌و بەم شێوەیە پێش ناکەوێت.

ئەوە سەرەتای ئیشکردنە بەمنداڵی ئۆتیزم، دەبێت دڵنیاش بین لەوەی کە منداڵی ئۆتیزم فێری ئەو بەهرانە دەبێت، بەڵام دەبێت دایك‌و باوك دان بەخۆیاندا بگرن‌و لەسەر ئەوە سووربوون کە منداڵەکەیان فێری زۆر شت دەبێت‌و بەرەو پێش دەچێت، نموونەی ئەم حاڵەتانەش لای زۆر خێزان هەیە.

# بەکارهێنانی ناوی شتەکان

پێویستە لەگەڵ منداڵی ئۆتیزم ناوی هەموو شتەکان لەماڵو لەشوێنە گشتییەکاندا بەکاربهێنرێت، کاتێک شتێکی پێشکەش بەمنداڵی ئۆتیزم دەکرێت، دەبێت ناوی ئەو شتەی پێ بوترێت، تەنانەت چاوی کەوتە سەر هەر شتێک، پێویستە ناوی ئەو شتەی پێ بوترێت، بەڵام دەبێت وتنی ناوی شتەکان بەهێمنیو لەسەرخۆو دووبارە بێت، تا باش تێی بگات، ڕاستە زۆر لەمنداڵانی ئۆتیزم قسەناکەن، بەڵام ئەوان دەبیستنو بەبیستنی ناوی شتەکان ئەو ناوانە لەمێشکیاندا کۆدەکەنەوەو دواتر شتەکان دەناسنەوە، منداڵی ئۆتیزم وەک منداڵی ئاسایی بەتێپەڕبوونی کاتو گەورە بوون، فێری شتەکان نابن، ئەوان پێویستیان بەهاوکاری هەیە، ڕەنگە تەمەنی منداڵێکی ئۆتیزم بگاتە پێنج ساڵ یان زیاتر، بەڵام لەڕووی زمانو قسەکردنەوە وەک منداڵێکی تەمەن ساڵ یان کەمتر بێت، بۆیە دەبێت خێزان زۆر بەهێمنیو لەسەرخۆ بێت لەگەڵ منداڵی ئۆتیزمدا.

هەندێ منداڵی ئۆتیزم دەتوانن زمانی ئاماژە بەکاربێنن، واتا کاتێک پێویستی بەشتێک دەبێت بەئاماژە داوای دەکات یان دەستی کەسێک دەگرێتو دەیبات بۆ لای ئەو شتەی مەبەستێتی،

تا ئەو شتەی پێ بدات، بەڵام لەم حاڵەتەدا پێویستە ناوی ئەو شتە بوترێت، کە دەدرێتە دەستی، واتا پێویستە هەموو شتێك دەبێت وەك خۆی ناوی بوترێت بۆ منداڵی ئۆتیزم و چاوەڕێی ئەوە نەبین، یەکسەر ناوی شتەکان فێرببن و بیڵێنەوە، ئەم پرۆسەیە دەبێت بەردەوام بێت. دوور نییە منداڵی ئۆتیزم لەداهاتوودا فێری ناوی شتەکان ببێت، چونکە منداڵی ئۆتیزم تا نۆ ساڵیش ئومێدی هەیە کە قسە بکات, پاشان لە بەر ئەوەی منداڵی ئۆتیزم لایەنی هەستیاری بینینیان بە هێزە بۆیە زۆر بە ئاسانی شتەکان دەناسنەوە, بۆیە واباشترە ئەو شتەی ئەوە داوای دەکات و مەبەستێتی کەسی بەرامبەر ( دایك بێت یان هەر کەسێکی تر ) ئەو شتە بخاتە لای دەمی و ناوی شتەکە بڵێت, بۆ نموونە کاتێك منداڵەکە داوای ئاو دەکات, پەرداخەکە دەخەیتە لای دەمت و دەڵێیت ئاو, ئاو دەخۆێت, ئاااااو, بەم شێوەیە لە بەر ئەوەی منداڵەکە ئەو شتەی مەبەستە دەوەستێت و سەیری دەم و چاو و جوڵەی دەم دەکات کاتێك دەڵێت ئاو.

زۆر جار پێویستە وێنە لەگەڵ منداڵی ئۆتیزمدا بەکاربهێنرێت، بۆ نموونە وێنەی ئەندامانی خێزان و وێنەی ئەو شتانەی ڕۆژانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، چونکە منداڵی ئۆتیزم

بینین و بیستنی پێکەوە باشترە، دەتوانین بڵێین هەستیاری بینینی بەهێزترە.

لەکاتی قسەکردن لەگەڵ منداڵی ئۆتیزمدا پێویستە ئاماژەش بەکاربهێنرێت، بۆ نموونە وشەی (وەرە) لای منداڵی ئۆتیزم هیچ مانایەکی نییە، بەڵام لەکاتی بەکارهێنانی وشەی (وەرە) بەدەست ئاماژە بکرێت، ئەوە ئاسانترە، یان پرسیارکردن سەبارەت بەناوخواردنەوە، بۆ نموونە (ئاو دەخۆیتەوە؟) بۆ کەسێکی ئاسایی زۆر ئاسانەو بەکاتێکی زۆر کەم وەڵام دەداتەوە، کە ئایە ئاو دەخواتەوە یان نا، بەڵام بۆ منداڵی ئۆتیزم (ئاو دەخۆیتەوە؟) هیچ مانایەك ناگەیەنێت، تەنانەت ئەگەر لەو کاتەش ڕاستەوخۆ سەیری چاوەکانت بکات، بۆیە دەتوانیت بەپەرداخێك ئاماژە بکەیت و لێی بپرسیت (ئاو دەخۆیتەوە؟)، بێگومان ئەگەر قسە نەکات، ئەوە وەڵام ناداتەوە، ڕەنگە دەستت بگرێت، ئەگەر ویستی ئاو بخواتەوە، یان بڕوات و هیچ ئاماژەیەکی نەبێت، بۆ ئەوەی کە ئاو ناخواتەوە، یان بەپێچەوانەوە ئەو منداڵانەی قسەدەکەن، ڕەنگە کێشەی لەڕاناوەکاندا هەبێت، پێدەچێت بەهەمان شێوە بڵێت (ئاو دەخۆیتەوە؟)، کە مەبەستی ئەوەیە (بەڵێ ئاو دەخۆمەوە)، یاخود ڕەنگە ناوی خۆی بڵێت، بۆ نموونە (شوان ئاو

دەخواتـــەوە)، واتـــا (بـــەڵێ ئـــاو دەخۆمـــەوە)، ئـــەم حاڵەتـــەش بـــەڕاهێنان باشـــتر دەکرێـــت، واتـــا بەڕاســـتکردنەوەی وەڵامـــەکان بەتێپەڕبوونی کات بەدروستی دەڵێت (بەڵێ ئاو دەخۆمەوە).

سەبارەت بەناوی منداڵەکە، پێویستە بـەردەوام نـاوی خـۆی بـەکاربهێنرێتو لەهـەموو جێگاکـان بـەو نـاوەوە بـانگ بکرێـت، نـەك بەچـەند نـاو و نازناوێکـەوە بـانگ بکرێـت، بـەم شـێوەیە تووشـی سەرسـوڕمان دەبێـتو وەڵامدانـەوەی نابێـت بـۆ هـیچ ناوێك، لەو ناوانەی بۆی دانراوە.

# ئۆتیزم و بەهرەمەندی

زۆر منداڵی ئۆتیزم هەیە، کە توانایەکی باشی لەبوارێك لەبوارەکاندا هەیە، بۆ نموونە وێنەکێشان، مۆسیقا، یان ژمارەو بیرکاری یان هەر بوارێکی تر، بەڵام مەرج نییە وەك منداڵێکی ئاسایی خەیاڵ لەکاتی وێنەکێشاندا بەکاربهێنێت، یان بەپێچەوانەوە کە وێنەی مرۆڤێك دەکات، لەشێکی جوانی پێ دەبەخشێت، بەڵام سەرو قژی ئاژەڵێکی دەخاتە سەر، هەندێ منداڵ هەیە، کە زۆر حەزیان لەئاژەڵەو لەکاتی وێنەکێشاندا زۆر بەجوانی وێنەی ئاژەڵ دروست دەکەن، بێگومان ئەم بەهرەو توانایە لەپڕداو هەر لەخۆیەوە سەرهەڵنادات، واتا پێویستی بەڕاهێنانو هاوکاری هەیە، کاتێك خێزان بینی، منداڵەکەی قەڵەم دەگرێتو دەتوانێت لەسەر (وەرەقە) شت بنووسێت، یان وێنەیەك بکێشێت، پێویستە هاوکاری بکاتو هەموو پێداویستییەکانی وێنەکێشانی بۆ دابین بکاتو پرس بەکەسێکی شارەزایی بواری وێنەکێشان بکاتو وێنەکانی منداڵەکەی بۆ ببات، بەم شێوەیە دەتوانرێت بەهرەکەی پەرەی پێ بدرێت.

بۆ هاندانی منداڵی ئۆتیزم لەسەر وێنەکێشان دەکرێت جێگایەکی بۆ تەرخان بکرێت لەماڵەوە بۆ وێنەکێشانو هەموو

ئەو وێنانەی دەیکێشێت، بۆی هەڵبواسرێت لەجێگایەك کە خۆی ببینێت، بەڵام هەندێ منداڵ هەیە ڕەنگە حەزنەکات، کەسانێکی تر بێن‌و سەیری وێنەکانی بکەن، یان لەکاتی وێنەکێشاندا سەیربکرێت، بۆیە پێویستە خێزان سروشتی منداڵەکەی خۆی بزانێت، پاشان ئەو هەنگاوانە بنێت، واتا نابێت کەسێکی تر ببرێت بۆ سەیرکردنی وێنەکانی، ئەگەر زانرا منداڵەکە پێی خۆش نییە کەس سەیری وێنەکانی بکات.

هەر منداڵێك بەگوێرەی تواناو ئارەزووی خۆی بەهرەیەکی تایبەتی هەیە، ئەم بەهرەیەش بەڕاهێنان‌و مامەڵەی ڕۆژانە دەردەکەوێت، پێویستە خێزان کاتێکی باش دیاری بکات بۆ گرەودان بەو بەهرەیە، ڕەنگە منداڵێکی ئۆتیزم لە (ئەلکترۆنیات) توانایەکی باشی هەبێت، یان لەوەرزش، بۆیە دەبێت خێزان ئەو باوەڕە لای خۆی دروست بکات، کەوا منداڵەکەی لەو بەهرەو توانایە دەتوانێت پێش بکەوێت، نابێت ئەو توانایە پشت گوێ بخرێت لە بەر ئەوەی ئەو منداڵە حاڵەتی ئۆتیزمی هەیە و ڕەنگ نیە پێش بکەوێت, بە پێچەوانەوە زۆر منداڵی ئۆتیزم هەیە کە ناتوانن پەیوەندی لە گەڵ کەسەکاندا دروست بکەن, چونکە ناتوانن قسە بکەن و گوزارشت لە هەستەکانیان بکەن، بۆیە دەبینین پەیوەندی لە گەڵ شتەکاندا زیاترە, ئەمەش هۆکارێکی گرنگە بۆ بەرەو پێشچوونی لە بەهەرەیەکدا.

# ئۆتیزم و دەربڕین

منداڵی ئۆتیزم کێشەی لەدەربڕینی هەستەکانی هەیە، واتا ناتوانێت وەك منداڵێکی ئاسایی گوزارشت لەهەستەکانی بکات، یان دەتوانین بڵێین ناتوانێت هەستەکانی وەك خۆی و لەکاتی خۆیدا بەکاربهێنێت، هەر ئەمەشە دەبێت هۆی دڵەڕاوکێ (قلق)و ڕەفتاری دووبارەو یەك ڕێچکە.

زۆربەی منداڵانی ئۆتیزم پەیوەندیی چاویان لاوازە، واتا سەیرکردنی چاوی کەسی بەرامبەر، یان بەهیچ شێوەیەك سەیری چاوی بەرامبەر ناکەن، یان هەندێ جار بۆ چەند چرکەیەکی زۆر کەم سەیری چاوی بەرامبەر دەکەن و بەخێرایی چاویان دەخەنە سەر شتێکی تر، ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە، چونکە چاو بەسەرچاوەی گوزارەشت دادەنرێت، پاشان چاو و پەیوەندیی چاو هاوکارە بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش هۆکارێکی سەرەکییە بۆ بەرەو پێشچوونی تواناکان.

منداڵی ئۆتیزم توانای دەربڕینی نییە، یان لاوازە، بێگومان دەربڕینیش مەبەستمان لەقسەکردن یان زمانی ئاماژەیە، نەبوونی ئەم دەربڕینەش کێشە بۆ خێزان و دەوروبەر

دروستدەکات، کاتێک منداڵێک هەڵبچێتو تووڕە ببێت، یان بگریو نەتوانێت دەربیبڕێت، کە بۆچی دەگریو چی دەوێت، چونکە هەموو رەفتارێك پاڵنەرێکی هەیە، رەنگە ئەو رەفتارەی ئەوان بریتی بێت لە داوا کردنی شتێك، لێرەدا وێنەو بەکارهێنانی وێنە رۆڵی خۆی دەبینێت، ئەمەش بەو شێوەیەی کە منداڵ فێربکرێت، ئەو شتەی مەبەستێتی بەوێنە داوای بکات، بێگومان راهێنانی منداڵی ئۆتیزم لەسەر وێنە کارێکی ئاسان نییەو کاتێکی دەوێت تا منداڵەکە فێرببێت، بەڵام ئەوەی گرنگە بزانرێت ئەوەیە کە منداڵ فێردەبێتو زۆر بەئاسانیش بەکاری دێنێت، ئەو منداڵانەش کە قسەدەکەن، ئەوە لەداهاتوودا کێشەی ئەوتۆیان لەدەربڕینو گوزارشتدا نابێت، بەبەراورد بەو منداڵانەی هیچ قسە ناکەن.

مرۆڤ بۆ ئەوەی دەربڕینی هەبێت پێویستی بە زمانی وەرگرتنە ( اللغة الاستقبالية) واتا دەبێت لە مانای ووشەکان تێبگات، چونکە ئەگەر زمانی وەرگرتنی نەبێت ( اللغة الاستقبالية) ئەوە ناتوانێت گوزارشت بکات، منداڵی ئۆتیزم لەم رووەوە کێشەی هەیە، واتا زمانی وەرگرتن یان بڵێین لایەنی وەرگرتنی لاوازە یان نیەتی، ئەمەش دەبێت هۆی لاوازی لایەنی دەربڕین و گوزارشت کردن بۆ داواکارییەکانی، بێگومان ئەم

لایەنە بە مامەڵە و هەڵسەنگاندن دەردەکەوێت، بۆیە گەر هاتوو دەرکەوت منداڵی ئۆتیزم لایەنی وەرگرتن و دەربڕینی لاواز بوو دەبێت بە بەرنامە هەوڵ بدرێت ئەو لایەنەی بە هێز بکرێت، ئەمەش دەبێت لە لایەن کەسانی شارەزاو پسپۆڕەوە هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت و دواتر بەرنامەی تایبەتی بۆ دابنرێت.

# ئۆتیزم و خۆشەویستی

منـــداڵی ئـــۆتیزم وەك هـــەموو منـــداڵێك پێویـــستی بەخۆشەویـستی هەیـە، بۆیـە پێویـستە بـەردەوام دایـكو بـاوك (خێـزان) خۆشەویـستی خۆیـان بـۆ منداڵەكـە دەربخـەن، بـەڵام پێویستە ئـەو خۆشەویستییە خۆشەویستی بێت نـەك بـەزەیی، چـــونكە خۆشەویـــستیو بـــەزەیی دوو شـــتی زۆر جیـــاوازن، خۆشەویـــستی هـــانی خێـــزان دەدات، كـــە بـــەردەوام هاوكـــاریی پێشكەش بەمنداڵەكە بكات بەپێچەوانەی بەزەییەوە، كە هـەموو شـتەكان پێـشكەش بەمنـداڵ دەكرێـت، لەبەرئـەوەی جیـاوازە لەمنداڵـەكانی تـر، ئەمـەش گـەورەترین زیـان بەمنـداڵی ئـۆتیزم دەگەیەنێتو خێـزانیش لەپێشكەش كردنـی هاوكاریو ڕاهێنـان سارد دەكاتەوە, یان ڕاهێنانـەكان بـە خواستی منداڵەكـە دەبێت, لـەكاتی تووڕەبـوونو هەڵـچوونی منـداڵی ئۆتیزمـدا، پێویـستە لـەئامێزی بگیرێـتو سـەری بخرێتـە بـاوەش (دایـك یـان بـاوك)، ئەمـە جگـە لـەوەی هێمنـی دەكاتـەوە، لەهـەمان كاتـدا هەسـتی خۆشەویـستی پـێ دەبەخـشێت، كـە ئـەوان بـەردەوام پێویـستیان بەوە هەیە هەموو خێـزان ئـەو خۆشەویـستییەیان بـۆ دەربخات، لێـرەدا ئـەوەی پێویـستە بێـزانین ئەوەیـە، كـە دەبێـت ئـەو

خۆشەویستییە لەلایەن هەموو ئەندامانی خێزانەوە وەك یەك بێت، لەهەمان کاتدا ئەو خۆشەویستییە نابێت ببێتە ڕێگر لەبەردەم ڕێنماییکردنی مندالّی ئۆتیزم، وەك چۆن دەبینین هەندێ خێزان بەهۆی خۆشەویستییەکی زیادەوە هەموو شتێکیان خستوەتە بەردەم مندالّەکەو لەهەر ڕەفتارێکی هەلّەشدا پێی ناوترێ هەلّەیە، واتا ئەمە خۆشەویستی نییە، بەلّکو ئەمە بەزەییە، بەلاّم خێزان بەخۆی نەزانیوەو وای زانیوە خۆشەویستی بۆ مندالّەکەی هەیە، بێگومان ئەمەش فێری هەندێ ڕەفتاری دەکات، کە دواتر لەلایەن کەسانی ترەوە هەولّ بدرێت، ڕێگری لێ بکرێت، لەهەر ڕەفتارێك بەتوندی تووڕە دەبێت و لەسەر ڕەفتارەکەی سوور دەبێت، هەر چەندە ڕەفتارەکەی هەلّە بێت، واتا مامەلّە کردن لە گەلّیدا زۆر قورس دەبێت و لە توانای کەسدا بێت ڕێگری لە ڕەفتارە هەلّەکانی بکات.

ڕەنگە هەندێ جار کە خێزان دەبینێت مندالّەکەی وەلاّمدانەوەی بۆ سۆزو خۆشەویستی نییە، بەتایبەت بۆ دایك، بۆیە پێیان وایە بەخشینی خۆشەویستیش بۆی سوودی نییە، بەلاّم ئەمە بیرکردنەوەیەکی هەلّەیە، چونکە مندالّی ئۆتیزم ئەگەر سەرەتاش لەخۆشەویستی تینەگات، بەلاّم بەتێپەڕبوونی

کاتو دوای ڕاهێنانی بەردەوام دەبینن، چەند وڵامدانەوەی بۆ خۆشەویستی هەیە, بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی مامەڵەی لە گەڵدا دەکەن و هاوکاری دەکەن و خۆشەویستی پێ دەبەخشن.

زۆر جار دەبینین لە خێزانێکدا منداڵێکی ئۆتیزم زاڵە بە سەر هەموو ئەندامانی خێزان و هەموو کۆنترۆڵی ماڵەکە بە دەستی ئەوە, ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوا ئەو خۆشەویستیەی پێی بەخشراوە, بەزەیی بووە, نەك خۆشەویستی، بۆیە دەبێت ئەو خۆشەویستیە نەبێتە ڕێگر لە بەردەم سزادان و پاداشت کردن, چونکە ئەمە زیان بە منداڵی ئۆتیزم دەگەیەنێت, بۆ ئەوەی زیاتر ڕوونی بکەمەوە, دەبێت خێزان ئەوە لە بیر نەکات ڕەنگە منداڵی ئۆتیزم هەمان ئەو خۆشەویستیەی لە دەرەوە دەست نەکەوێت, بۆیە دەبێت مامەڵە کردن لە گەڵ منداڵی ئۆتیزم بە شێوەیەك بێت کە بگونجێت لە گەڵ ژینگەی دەرەوەی خێزان, وەك قوتابخانەو باخچەی ساوایان و سەنتەرە تایبەتەکان.

# ئۆتیزم و...
# پاداشت و سزا

کاتێك کە منداڵی ئۆتیزم قسەناکات و ناتوانێت گوزارشت لەهەستەکانی بکات، یان کاتێك شتێکی پێشکەش دەکرێت، ناتوانێت خۆشییەکانی بەشێوەیەکی دروست دەرببڕێت، ئیتر خێزان پێی وایە، پاداشتکردنی منداڵی ئۆتیزم سوودی نییە، بەپێچەوانەوە زۆر سوودی هەیە، بەڵام فێرکردنی منداڵی ئۆتیزم بۆ پاداشت وەك هەموو ڕاهێنانەکانی تر کاتی دەوێت.

شێوازی پاداشتکردنی منداڵی ئۆتیزم چۆن دەبێت؟ ئایە هەر وەك منداڵێکی ئاسایی پاداشت دەکرێت، یان شێوازی پاداشتکردنەکەی جیاوازە؟

دەبێت خێزان بزانێت چی شتێك لای منداڵەکەی گرنگەو حەزی لێیەتی، ئەو شتە یاری بێت، یان خواردن یان هەر شتێکی تر، بەمەرجێك ئەو شتە سوودبەخش بێت، بۆیە ئەو شتە وەك پاداشت بەکاردێت، واتا هەر کارێکی لەگەڵ ئەنجام بدرێت، ئەگەر هاتوو بەباشی ئەنجامی دا، ئەوە دەبێت پاداشت بکرێت، بۆ نموونە کارێکی پێ ڕادەسپێریت، یان لەکاتی ئەنجامدانی ڕاهێناندا، دەکرێت لەکۆتاییدا منداڵەکە پاداشت بکرێت، بەو

شتەی حەزی لێیەتی، بۆ نموونە حەزی لەیاری جۆلانێ یان ترامپۆلی یان هەر یاریەکی تر بێت، دەکرێت ڕێگە پێ بدرێت، ئەو یارییە بکات، دوای ئەنجامدانی چالاکییەکەی یان ڕاهێنانەکەی، یان خواردنێك یان بردنە دەرەوە بۆ جێگایەك کە پێی خۆشەو پێشتر رۆشتوەتە ئەو جێگایە، بێگومان دەستخۆشیو ماچکردنو لەئامێزگرتنی بەردەوام وەك پاداشت گرنگی خۆی هەیە، بەم شێوەیە منداڵەکە زۆر بەباشی چالاکییەکان ئەنجام دەدات، ئەگەر دڵنیابوو، دوای ئەو چالاکییە پاداشت هەیە، بەڵام دەبێت ئەو کەسە خاوەن بڕیاربێتو بەئەنجام نەدانی ئەو چالاکییە، نابێت منداڵەکە پاداشت بکرێت، لەکاتێکدا ئەگەر منداڵەکە هەوڵیدا، چالاکییەکە ئەنجام بدات، بەڵام هەڵەی کرد، دەکرێت هاوکاری بکرێت، ئەگەر بەباشی چالاکییەکەی ئەنجامدا ئەوە پێویستە پاداشت بکرێت، بەم شێوەیە هاوکاریی منداڵ دەکرێتو هاندەدرێت بەرەو پێش بچێت، ئەوەی گرنگە بزانێت ئەوەیە، دەبێت پاداشتەکە دیاربێتو منداڵەکە بیبینێت. بۆ ئەوەی منداڵ لەپاداشتو هاندان تێبگات، پێویستە سەرەتا بەو یاریانە دەست پێ بکرێت، کە خۆی حەزی لێیەتیو چێژیان لێوەردەگرێت، لێرەوە فێردەبێت لەپاش ئەنجامدانی کاری باش پاداشت دەکرێت، دواتر

دەکرێـت، هـەنگاو هـەنگاو یـاری‌و ئـەرکی قـورس تـری پـێ ڕاپـسپێنرێت‌و لەئەنجامـدا پاداشـت بکرێـت، تەنانـەت خێـزان دەتوانێـت لەئـەنجامی هـەر ڕەفتـارێکی بـاش پاداشـتی بکرێـت. خـاڵێکی زۆر گـرنگ هەیـە، کـە دەبێـت خێـزان‌و ڕاهێنـەران‌و ئەوانەی لەگەڵ منداڵی ئۆتیزمدا کاردەکەن، بیزانن، ئـەو خاڵـە ئەوەیـە کـە نابێـت، پاداشـت وەك بـەرتیل بـەکاربهێنرێت، واتـا نابێـت بەمنداڵەکە بوترێت، وەرە ئـەم چالاکییە یـان ئـەم کـارە ئـەنجام بـدە، پاشـان خواردنـت دەدەمـێ، یـان بـوترێ ئەمـە بکـە، دواتر دەتبەم بۆ جێگایەك، یاخود لەدوورەوە پاداشتەکەی نیشان بدرێت‌و پێی بوترێت، وەرە دانیشە، پاشان ئـەو شـتەت دەدەمـێ، لێـرەدا منـداڵ فێـری بـەرتیل دەبێـت‌و لـەداهاتوودا هـیچ کـارو چالاکییەك ئەنجام نادات، ئەگەر پاداشت نەبێت، لە هەمان کاتـدا ئـەوە گرنگـە دەبێـت پاداشـت هێـدی هێـدی کـەم بکرێتـەوە، بـۆ ئـەوەی منداڵەکـە فێـر نـەبێت تـەنها بـە پاداشـت کارێـك ئـەنجام بدات، واتا دەکرێت هێـدی هێـدی ئـەو پاداشـتە وەك پاداشـت بـە کـار نـەهێنرێت، بـەڵکو بـە بـێ ئەنجامـدانی ئـەرك و کـارو چالاکییەکان دەکرێت ئەو شـتەی ( یـاری یـان خـواردن یـان هـەر شتێك بێت ) بۆ ماوەیـەکی دیـاری کـراو بخرێتـە بەردەسـتی، لـە هەمان کاتـدا واباشـتر شێوازی کـەم کردنـەوەی ئـەو پاداشـتە بـە

بەرنامە بێت، بۆ نموونە ئەگەر هاتوو بۆ ماوەی ( ١٥ ) خولەك دانیشت و كارو چالاكییەكانی ئەنجامدا پاشان پاداشت كرا، دەكرێت دوای چەند ڕۆژێك ماوەی كارو چالاكییەكان زیاتر بكرێت، واتا لە ( ١٥ ) خولەكەوە بكرێت بە ( ٣٠ ) خولەك، واتا دوای ( ٣٠ ) خولەك پاداشت بكرێت، بەم شێوەیە دوو ئامانج دەپێكیین، یەكەم: پاداشت كەم دەكرێتەوە و تا وای لێدێت پاداشت نامێنێت، دووەم: منداڵەكە فێر دەبێت ئارام بگرێت و فێر ببێت چاوەڕوان بێت.

دەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت دەبێت تەنها بە پاداشت كار نەكەین لە گەڵ منداڵی ئۆتیزمدا، واتا ئەو كاتەی لە سەر ڕەفتاری باش پاداشت دەكرێت، دەبێت لە سەر ڕەفتار و هەڵسوكەوتی هەڵەش سزابدرێت، لێرەدا مەبەستمان لە سزا لێدان و ئەشكەنجە نیە،چونكە لێدان و توندوتیژی كاریگەری خراپی دەبێت و منداڵی ئۆتیزم دوادەخات لە بەرەو پێش چوون، بەڵكو مەبەستمان لە سزای ( معنەووی) واتا لێسەندنەوەی پاداشتەكەو ڕێگە پێنەدان بە یاری كردن بەو یارییانەی حەز ئەكات یارییان پێ بكات، یان كۆكردنەوەی ئەو یاریانەی بڵاوی كردەوەتەوە، یاخود هەندێ جار پێویست دەكات زیاتر لە ئەركێكی پێ ڕابسپێردرێت وەك سزا، بۆ ئەوەی زیاتر

رون بێت بۆ هەموو لایەك ئەم نموونە دەخەینە روو، ئەگەر هاتوو منداڵی ئۆتیزم رەفتارێکی خراپی نواند، وەك بڵاو کردنەوەی یارییەکانی یان شکاندنی هەندێ شت، بۆ ئەوەی ئەم رەفتارە زیاد نەکات، دەبێت منداڵەکە سزا بدرێت، بۆ نموونە هەموو یارییەکانی پێ کۆ دەکرێتەوە، ئەگەر بە سزادان ئەم رەفتارە کەم نەبووەوە یان بنبڕ نەبوو ، ئەوە دەکرێت لە یەك کاتدا دوو سزا بدرێت، بۆ نموونە یارییەکانی پێ کۆدەکرێتەوە و دواتر کارێکی تر پێ ئەنجام بدرێت، بەم شێوەیە کە بۆی دەرکەوت رەفتاری باش پاداشت دەکرێت و رەفتاری خراپ سزادەدرێت، دەبینیت رەفتارە باشەکان زیاتر دەبێت، چونکە ئەمە بریتیە لە رێکخستنی رەفتار، بەڵام دەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت پاداشت و سزا و کاریگەرییەکانی لە سەر منداڵی ئۆتیزم لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر جیاوازە، رەنگە زۆر بە زووی کاریگەری لە سەر منداڵێك دەربکەوێت، رەنگە ماوەیەکی زۆر بخایەنێت، بۆیە پێویستە خێزان و پسپۆران و ڕاهێنەران لەم رووەوە تووشی بێهیوایی نەبن و کۆڵ نەدەن، چونکە دڵنیابن کاریگەری دەبێت.

# هەندێ ڕێنمایی بۆ خێزان

١.پێویستە خێزان جیاوازی منداڵەکەی بەبەربەست سەیرنەکات، چونکە ئەو جیاوازییە زۆر جار دەبێت بەخاڵی بەهێز لەداهاتوودا. دەبێت خێزان سووربێت، لەسەر ئەوەی منداڵەکەی فێر دەبێت. ڕەنگە فێرکردنی بچووکترین توانا ماوەیەکی زۆر بخایەنێت، بۆیە نابێت خێزان تووشی بێ ئومێدی ببێت، بەپێچەوانەوە ڕەنگە زۆر بەخێرایی ڕابێت‌و بەرەو پێش بچێت.

٢. پێویستە خێزان ئەو خاڵانە بزانێت، کە دەبنە هۆی هەڵچوون‌و تووڕەبوونی منداڵەکە، چونکە بەنەزانینی ئەو هۆکارانە هەڵچوون‌و تووڕەبوونی منداڵ زیاددەکات‌و دوور نییە ئازاری خۆی یان کەسانی بەرامبەر بدات.

٣. هەندێ منداڵ هەست بەبرسێتی ناکەن، بۆیە پێویستە خێزان ئاگاداری ئەم خاڵە بێت‌و بەبەرنامە کاتی ژەمەکانی خواردنی دیاری بکات، دەکرێت ئەم بەرنامەیەش بەوێنە بێت، بەپێچەوانەوە هەندێ منداڵی ئۆتیزم هەیە، هەست بەتێربوون ناکەن‌و بەردەوام هەست دەکەن، برسیانەو ڕەنگە ئەگەر وازی لێبێنن، لەسەر خواردن هەڵنەسێت، ئەمەش خۆی لەخۆیدا

کێشەیەو بەتێپەڕبوونی کات منداڵەکە زۆر قەڵەو دەبێتو توانای ڕاهێنانو جووڵەی نامێنێتو دوور نییە، مادە ژەهراوییەکانی لەشی زیادنەکات.

٤. ڕەنگە منداڵەکەت لەشتی مەترسیدار نەترسێت، وەک چوونە جێگایەکی بەرز، بەپێچەوانەوە ڕەنگە لەهەندێ شت بترسێت، کە مەترسیدار نین، بۆ نموونە ترس لە مێرووولە، بەڵام لەهەموو حاڵەتەکاندا نابێت، تووڕەببنو ئازاری بدەن، پێویستە زۆر بەهێمنی فێربکرێت، چی مەترسیدارەو چی مەترسیدار نییە، بەتێپەڕبوونی کات دەبینن زۆر بەئاسانی ڕادێت.

٥. نابێت منداڵەکەت لەژینگەی دەرەوە دابڕێت، چونکە ژینگەی دەرەوە هاوکاریی دەکات بۆ فێربونو تێکەڵبوونو زۆر شتی تر.

٦. منداڵەکەت پێویستی بەوە هەیە، لەکاتی ئەنجامدانی هەر کارێکی باش پاداشتی بکەی، ئیتر ئەو پاداشتە خواردن بێت، یان یاریکردن، یان هیچ نەبێت لەباوەشکردنو هاندانی.

٧. هەندێ جار منداڵەکەت بەهۆ یان بەبێ هۆ هاواردەکاتو تووڕە دەبێت، بۆیە باشتر وایە، لەو جێگایە دووری بخەیتەوە، چونکە ڕەنگە شتێك بووبێتە هۆی ئەو هەڵچوونە، بەڵام بۆ تۆ

هەو هۆکارە نەزانراوە، یان هیچ نەبێت هەوڵ بدە، هەموو ئەو شتانەی دەنگی هەیە، بێدەنگی بکەی، بۆ نموونە تەلەفیزیۆن.

٨. ڕەنگە هەندێ جار منداڵەکە بەجلەکانی بێزاربێت، بۆ نموونە بلوزەکەی یان قەمسەڵەکەی یان جلێکی تازە، بۆیە دەبێت ئەو جلانەی دابکەنرێت، کاتێك هەستکرا بووەتە هۆی بێزاربوونی.

٩. نابێت هەوڵی گۆڕینی ڕەفتاری منداڵەکە بدەی لەو جێگانەی ڕەفتارێك دەنوێنێتو بۆ تۆ ئەو ڕەفتارە دەبێتە مایەی شەرمەزاریت، چونکە ئەوان کەسانی لادەر نین، تا هەوڵ بدرێت ڕەفتاریان بگۆڕدرێت.

١٠. ئەو منداڵانەی سەر دەجووڵێننەوە بۆ پێشەوە یان دواوە، بۆ ئەوەی ئەو سەر جووڵاندنە نەبێت هۆی کەوتنی یان بەرکەوتنی بەر شتێکی ڕەقو ئازاری بدات، باشتر وایە، کورسی جووڵاو (کورسی هزاز)ی بۆ بەکاربێنن.

١١. زۆربەی منداڵانی ئۆتیزم ڕەفتاری ئازاردانی خۆی یان بەرامبەری دەبێت، ئەمەش حاڵەتێکی باش نییە، بەڵام دەتوانرێت ئەم ڕەفتارەی کەم بکرێتەوە.

١٢. تۆ بەتەنها نیت، کە منداڵی ئۆتیزمت هەیە، دڵنیابە، کە کەسانی تر هەیە، منداڵی ئۆتیزمیان هەیە، بەڵام ژیانیش لێرەدا

کۆتایی نایەتو ناوەستێت، دڵنیاش بەکەسانێك دەبێت هاوکاریت بکات.

١٣. قوتابخانــە باشــترین جێگایــە بــۆ ڕاهێنــانو گەشــە کۆمەڵایەتیو تواناکانی منــداڵ، بۆیــە ئەگــەر منداڵەکەت توانــای قسەکردنی لەقوتابخانە هەبوو، بێبەشی مەکەو گوێ بەقسەی دەوروبــەر مــەدە، دڵنیابــە کەســانێك دەڵــێن، منداڵەکــەت بــۆ قوتابخانە نابێتو دەبێتــە هۆی تێکچوونی ژینگەی پۆل، بــەڵام ئــەوەی گرنگــە تابتوانرێــت هــەوڵ بــدرێت ژینگــەی ئــەو قوتابخانەیە لە بار بێت بۆ منداڵەکە .

١٤. منداڵی ئۆتیزم کاتی خەوتن و هەڵسان لە خەو نازانێت، ئەوەش پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە تــا ڕابێت، بــەڵام دڵنیابــە کە ڕادێت.

١٥. منداڵی ئۆتیزم لە ووشەی ( عەیبە ) تێناگات، بۆیە ئــەو ووشەیەی لە گەڵدا بە کار مەهێنە.

١٦. هەوڵبدە کە قسە دەکەی لــە گــەڵ منداڵەکەتــدا لــە گــەڵ ووشەکان ئاماژە بە ووشەکان بکە، واتا جوڵە لە گــەڵ ووشــەکاندا بە کار بێنە.

١٧. کورتترین و ئاسان ترین ووشە و ڕستــە لــە گــەڵ منــداڵی ئۆتیزم بە کار بێنە.

## کورتەیەك لەسەر نووسەر:

ڕەحمان عەلی قادر

لەساڵی ١٩٧٧ لەناوچەی زەنگاباد لەگەرمیان لەدایکبووە.

خوێندنی سەرەتای و ئامادەیی لە ئۆردوگای ڕزگاری تەواوکردوە.

ساڵی ٢٠٠٢ زانکۆی سلێمانی/کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان/بەشی کۆمەڵناسی تەواوکردوە.

ساڵی ٢٠٠٣ وەك پسپۆری کۆمەلایەتی لەچاکسازی (بەندیخانە) دامەزراوەو تا ٢٠١٠ لەوێ کاری کردوە.

لەساڵی ٢٠١٠ وە وەك پسپۆری کۆمەلایەتی لەسەنتەری ئۆتیزم کاردەکات.

E.mail: rahmanali٢٠٠٦@hotmail.com
Facebook: Rahman Ali رحمن علي

## ئۆتیزم...

ئۆتیزم بریتیە لە شلّژان یان تێکچوونی گەشەی دەمارەکانی مێشك ، ئەمەش کاردەکاتە سەر کارو فەرمان و چالاکیەکانی مێشك، لە سێ بورای سەرەکیدا گرفت بۆ منداڵ درووست دەکات :

1- پەیوەندی زارەکی و نازارەکی.
2- پەیوەندی کۆمەلایەتی.
3- رەفتاری دووبارەو یەك رێچکە( گرنگیدان بە شتێك).

ئەم نیشانانە لە سێ ساڵی یەکەمی تەمەنی منداڵدا دەردەکەوێت.

تا ئێستا لە جیهاندا بەتەواوەتی هۆکاری تووش بوون بە ئۆتیزم نەزانراوە، تا دێت رێژەکەشی لە زیادبووندایە، کوڕان لە کچان زیاتر توشی ئۆتیزم دەبن.

ئۆتیزم پەیوەندی بە چینی کۆمەلایەتیەوە نیە وەك؛(هەژاری و دەوڵەمەندی، خوێندەوار و نەخوێندەوار ..)






